# پێشـــــــەکی وەرگێڕ

الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على رسوله الأمين وعلى آله وصحبه الطيبين الطاهرين ومن سار على نهجهم واقتفى أثرهم إلى يوم الدين.

زانستی قیرائات لەکوردستاندا مێژوویەکی دوورو درێژی نییە وسالآنێکی کەمە بایەخی پێدەدرێت ، ئینجا لەبەرئەوەی جوان خوێندنەوەی قورئانیش بەشێکی سەرەکی و دانەبڕاوە لە زانستی قیرائات،بۆیە کاریگەری بایەخ نەدان وپشتگوێ خستنیئەم زانستە کاریگەرییەکی خراپ ونەخوازراوە ، درەنجامیش دەبینین نەك هەر کەسانی شارەزا و پسپۆڕ لەم بوارەدا کەمن ، بەڵکو خوێنەرانی قورئانی پیرۆز بە شێوەیەکی ڕێکوپێك و بەڕیوایەتی ( حفص ) یش هەر کەمن بە زۆرێك لە ماموستایانی ئایینیشەوە، بەلآم سوپاس بۆ خوا وا چەند ساڵێکە گەنجان وماموستایان بەڕێژیەکی بەرچاو بەرەوڕووی ئەوزانستە دەچن ولە کانیاوی سازگاری وەردەگرن.

بەندەش وەکو باسکرنی فەزڵ وچاکەی خوای گەورە بەسەرمەوە یەکەم کارم پاش وەرگرتنی ئیجازەی قیرائاتی عەشرە لە جەنابی ماموستا دلێر, کە دوو ساڵ بە بەردەوامی زەحمەتی کێشا لە گەڵمدا تەنها لەبەر

خوای گەورە و بێ ئەوەی هیچ پەیوەندییەكی حیزبیم لە گەڵ كۆمەڵی ئیسلامی یان هیچ حیزبێكی تر هەبێت, كە ئەوەش نیشانەی گەورەیی ئەو پیاوەیەو خۆ یەكلاكردنەوەیەتی بۆ زانستی قیرائاتی قورئانی, خوای گەورە پاداشتی خێریان بداتەوە, پاش وەرگرتنی ئیجازەكەم شەرحێكی پوختەم لە سەر (المقدمة الجزرية) بە زمانی كوردی نووسی كە پێشتر بە كوردی ڕاڤە نەكرابوو، هەروەها بە گوێرەی توانای خۆم لە دەڤەری گەرمیان هەستاوم بە بڵاوكردنەوەی ئەوزانستە وئێستا فێرخوازان قیرائاتی عەشرە بە جیاجیا لەلام دەخوێنن، هاوكات خۆم وهەندێ لە هاوەڵ و قوتابییەكانم هەستاین بە دامەزراندنی ناوەندێك بۆ قیرائات ولەبەركردنی قورئانی پیرۆز بە ناوی ( ابن الجزري بۆ قیرائات و لەبەركردنی قورئانی پیرۆز) كەسوپاس بۆ خوا بۆ ماوەی سێ ساڵێكە چالاكییەكانی لەدەڤەری گەرمیان ئەنجام ئەدات و لە چەندین خولی گەورەشدا ژمارەیەكی زۆرفێرخوازی قیرائاتی قورئانی لە هەردوو ڕەگەز لێی بەهرەمەند بوونەو, ژمارەیەكی بەرچاو لە خوێنەرانی قورئانی پیرۆز پاشتەواوكردنی خەتمە لەسەر دەستی مامۆستای لێهاتوو ئیجازەیان لەم ناوەندە وەرگرتووە, جگە لە چەندین پرۆژەی جۆراوجۆر پەیوەندیدار بەم زانستەوە كە بەرنامەی ئەنجامدانیمان دارشتووە.

ئەوەشی پیم گرنگەئاماژەی پێ بکەم ئەوەیە, زانستی قیرائاتی قورئانی لە کوردستاندابە ئاڕاستەی ڕاست و درووستی خۆیدا ناڕوات و هەڵەی زانستی وبنچینەیی تێدا ئەنجام دەردرێت, هاوکات هەندێ مامۆستا پەیدابوونە چی ئەوانەی لە کوردستان هەن و چی هەندێ لەوانەی لە شوێنەکانەوە هاتوون, ئاراستەی ئەم زانستە پیرۆزەیان لە ڕێڕەوی خۆی لابردووە و بۆیە ئەم بوارە پێویستییەکی هەنووکەیی هەیە بۆ چاکسازی, ئەگینا دوای چەند ساڵێك و لە دەرەنجامی سووك وەرگرتنی مەسەلە زانستییەکان و چاوپۆشی کردن لە هەندێ هەڵە و لادانی زانستی کە ناکرێت چاوپۆشی لێبکرێت, ئەم زانستە لە جێگای ئەوەی هاندەرێك بێت بۆ پەرەپێدانی توانای موسوڵمانان لە زانستی قیرائات و جوان خوێندنەوەی قورئانی, دەبێتە بەڵگەیەکی خراپ لەسەرمان لە لای خوای گەورە و لە لای نەوەی داهاتوویش, چونکە مافی ئەو زانستەمان نەدا.

ئەم کتێبەش وەکوخزمەتێك بۆعیلمی قیرائات بە گرنگم زانی وەریگێڕمە زمانی کوردی، گرنگیشی لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کەلەلایەن کەسێکی پسپۆڕ وئەکادیمی وەکو دکتۆر (إبراهيم الدوسري) نووسراوە، ئینجا بابەتی کتێبەکەش بریتیە لە پێناسەیەکی زانستی پوختە بۆ سەرجەم ئەو زاراوانەی فێرخوازی قیرائات پێویستی پێیان دەبێت، من وەکو

وەرگێڕێك هیچ دەستکارییەکی بابەتەکانم نەکردووە ئەوەندە نەبێت سەرچاوەکانم لە پەراوێزەکانەوە گواستەوە بۆ خشتەی سەرچاوەکان وهەر هەموویانم لەوێ جێگیر کرد چونکە نووسەر بە گشتی پشتی بەو کۆمەڵە سەرچاوانە بەستووە.هەروەها ساڵی وەفاتی ئەوپێشەوایانەی باسیان هاتووە لەگەڵ ناوەکە لەنێو کەوانەیەکدا بە (ك د ) ئاماژەم پێکردووە، واتە: کۆچی دوایی..ئەمەو داواکارم لە خوای پەروەردگار ئەم کارەم لێ وەربگرێت وشەرەفی خزمەتی قورئانەکەیم پێ ببەخشێت وبەهرەمەند ببم لە نزای چاکەی هەر کەسێك لێی سوودمەند دەبێت ..إنه وليّ ذلك والقادر عليه، وسبحانك اللهم وبحمدك أشهد ألا إله إلّا انت أستغفرك وأتوب إليك.

إحسان برهان الدين

سلێمانی 22 -1 -2017

# پیتی ئەلیف

**1- الائتناف : بڕوانە :الابتداء**

**2- الإبتداء:**

- **الإبتداء الحقيقي : واتە دەستپێکردنی ڕاستەقینە , کە سەرەتای قسەی قسەکەرە و قسەی تر نیە لە پێشەوەی , ئەوەش تەنها لە سەرەتای قورئان خوێندنەوە دەبێت .**
- **گەڕانە بۆ قورئان خوێندن پاش ڕاوەستان , زانایان لەسەر ئەم واتایەن لە ناونانی زانستی ڕاوەستان و دەستپێکردن (علم الوقف والابتداء ) کە ڕاوەستانیان خستووەتە پێش دەستپێکردنەوە , چونکە وتەکانیان دەربارەی ڕاوەستان هەڵقوڵاوە لە باسی پێگەیاندنی خوێندنەوە , دەربارەی دەستپێکردنیش کە لە ئە نجامی باسی ڕاوەستان دروست دەبێت دواتر دەست دەکاتەوە بە خوێندن , بۆیە بە (الابتداء)**

دەوترێت ( الائتناف ) وەکو ئەوەی ( أبو جعفر النحاس ) ئە نجامی داوە لە کتێبی ( القطع والائتناف ).

## 3-الإبدال :

واتە : دانانی پیتەکانی ( أ, و , ي ) لە جێگەی ( ء ) , بیٚ ئەوەی هیچ شوێنەوارێکی هەمزەکە بمێنێتەوە 0

- پیتێك بخرێتە جێگەی پیتێکی تر , ئەمەش بەپێی بیستن و گێڕانەوەیە 0

## 4-الابنان :

واتە هەردوو ( ابن ) کوڕەکە , مەبەست لە( ابن عامر الشامی ك د 188ك ) و , ( ابن كثير المكي ك د 120ك ) جا ئەگەر بێت و لە چواردە پێشەواکانی قیرائات ( أبن محيصن المكى ) بخرێتە پاڵیان پێیان دەوترێت ( البنون ) واتە : کوڕەکان .

## 5-الأبوان :

واتە :هەردوو باوکەکان : مەبەست لەوانە( ابو عمرو البصري ك د 154 ك ) و , ( أبوجعفر المدني ك د 130 ك ) .

هەروەها (ابو عمروالبصري) و (أبو بكر شعبة ك د 130 ك) دەگرێتەوە .

**6-الإتمام:** بڕوانە : الإشباع .

**7-الاثنان :**

دووانە کە : مەبەست لەم زاراوەیە (ابن عامر الشامی) و (نافع المدني)

**8-الإجازة:** واتە مۆڵەتدان .

مەبەست لەم زاراوەیە مۆڵەتدانی خوێنەرە بەڕیوایەتێك یان زیاتر کە قورئان بە خەڵکی بڵێتەوە , ڕووبەڕووبوونەوەی قوتابی و مامۆستا لەم حاڵەتەدا مەرجە , چونکە هەندێ لە زانستی قیرائات بەو شێوەیە نەبێت ئەنجام نادرێت .

**9-الإجراء :**

مەبەست لە (تەنوین ) ە , (المجرى ) واتە : تەنوین کراو , وەکو خوێندنەوەی (إن ثمودا ) , بەتەنوین , یان وازهێنان لە تەنوین و (صرف ) وەکو : (ان ثمودا ) .

10-الإحتجاج للقراء ات:بڕوانە توجيه القراءات .

11-الاحرف السبعة:حەوت پیتەکە .

مەبەست لەم زاراوەیە ئەو شێوەزارانەیە کەعەرەب قسەیان پێ دەکرد و قورئانیش بەو شێوەزارانە دابەزی , جا ئەو حەوت پیتە مەبەست لە حەوت شێوەزارانەی زمانی عەرەبیە کە ناوبانگیان هەبوو وقسەیان پێ دەکرا , هەروەها دەگێڕنەوە واتاکەی بریتییە لە حەوت شێواز لە شێوازەکانی خوێندنەوەی قورئان , چەند بۆچوونێکی تریشی لەسەرە .

12-الاختطاف : بڕوانە : الاختلاس .

13-الاختلاس:واتە :

*دەربڕینی هەندێك لە جووڵەی پیتەکە لە کاتی بەردەوام بوون لە خوێندن , هەموو جووڵەکانیش دەگرێتەوە وەکو سەروبۆرو ژێر , ئەو

لابراوەش لە جووڵەکە مەزەندە دەکرێت بە سێ یەك و ئەوەش کە دەردەبڕدرێت مەزەندە دەکرێت بە دوو لەسەر سێ , ئەوەش هاوواتایە لە گەڵ ( الإخفاء ) و ( الإختطاف ).

*جووڵە پێدانی ( هاء الكناية ) بەبێ ( صلة ) واتە : بەبێ درێژکردنەو .

14-اختلاف التضاد :واتە : جیاوازی دژەیەکتر .

مەبە ست لەم زاراوە یە ج یاوازی قیرائەتەکا نە لە ڕووی دەربڕی نەوە هاو کات لە گەڵ ج یاوازی و ڕێ کەوتنی واتا کە , ئەمەش بە هیچ شێوەیەك لە قیرائاتدا بوونی نییە .

15-أختلاف التغاير :واتە : ناکۆکی جیاوازبوون .

مەبەست لەم زاراوەیە جیاوازی قیرائەتێکە لە دەربڕین و واتادا, هاوکات هەردوو واتاکەش تەواوبن , وەکو فەرموودەی خوای گەورە ( قال لقد علمت ما أنزل هؤلاء إلا رب السموات والأرض بصائر ) الأسراء / 102.

بە خوێندنەوەی پیتی ( ت ) لە وشەی ( علمت ) بەسەروبۆر چونکە فیرعەون بە موسای ووت : ئەو بەڵگانەی تۆ هێناوتن سیحرو جادون ,

ئەویش وەلآمی دایەوە : من دەزانم کە ئەوبەلگانە سیحرو جادوونین , بەلکو ڕێگا ڕۆشن کەرەوەن , جارێکی تریش فەرمووی : تۆ ئەی فیرعەون دەزانی کە ئەو بەلگانە جادوونین و ڕێگا ڕۆشن کەرەوەن .

هەروەها وەکو : ( ان المصدقين والمصدقات ) بە شەددەی هەردوو پیتی (ص) لە دووشەکە بە واتای (صدقة) واتە:بەخشین , یان خوێندنەوەیان بەبێ شەددە بە واتای (تصديق) واتە : باوەڕپێکردن , ئەم دوو واتایەش لە بەندەی ئیماندااردا کۆدەبنەوە .

## 16-إختلاف التنوع :واتە : جیاوازی هەمە جۆر .

مەبەست لەم زاراوە یە جیاوازی دەربڕین و یەکگرتنی واتاکەیانە , وەکو (یحسب ) بە خوێندنەوەی سەرووژێر بۆ پیتی (س) , یان خوێندنەوەی بۆرو نیشانەی وەستان (الضمه والسکون ) بۆ وشەی (القدس ) , یان ( نزل ) بەشەددەو بێ شەددەی پیتی (ز) .

## 17-الإختيار :واتە هەڵبژاردن :

ئەم زاراوەیە لە قیرائاتدا مەبەست لێی وا بەستەبوونی پێشەوایەکی قیرائاتە بۆ شێوازێك یان چەند شێوازێکی قیرائاتی قورئانی , ئیتر بە هۆی ناوبانگ دەرکردن و بەردەوام بوونی لە سەر قیرائەتەکە دەدرێتە پاڵ ئەو پێشەوایە , نەك خۆی دایهێنابێت یان دروستی کردبێت , یان بۆچوون و کۆششی خۆی بێت , ئەو هەڵبژاردنە پێی دەوترێت ( حرف ) یان ( قراءة ) یان ( أختیار ) بۆ نموونە دەوترێت : ( هەڵبژاردنی ( نافع ) و خوێندنەوەی ( نافع ) و ( حرف ) ی ( نافع ) , هەروەها دەوترێت ( خلف البزار ك د229ك ) لە خوێندنەوەکەیدا لە خۆیەوە , یان لە هەڵبژاردنەکەیدا , هەردووکی بەیەك واتایە , واتە : لەو خوێندنەوەی کە خۆی هەڵبژاردووە نەك ئەوەی کە لە( حەمزەك د 156ك ) دەیگێڕێتەوە ئینجا ( اصحاب الاختیارات ) بریتین لەو هاوەڵ و تابیعی و دەپێشەواکانی قورئان خوێندن و کەسانی لەو شێوە کە گەیشتوونەتە پلەو پاییەی بەرز لە گێڕانەوەو زانستەکانی شەرع و زمانەوانی .

**18-آخر الأية :**بڕوانە :. رؤوس الآي .

**19-الإخفاء :**واتە : شاردنەوە .

إخفاء الحركه : بریتیه له دەربڕینی هەندێك له جووڵەی پیتەكه له كاتی بەردەوام بووندا , هەموو جۆره بزوێنەكانیش دەگرێتەوه وەكو سەروبۆروژێر , لابراوەكەی بەسێ یەك و دەربڕاوەكەی بەدوو لەسەر سێ مەزەنده دەكرێت , هاوواتایشه له گەڵ ( الإختلاس ) و ( الإختطاف ) دا , جارجارەش له ڕووی فراوان بوونەوه به ( الروم ) ناو دەبرێت .

*شاردنەوەی پیتی نوونی وەستاو و تەنوین , یان پیتی میمی وەستاو له گەڵ پیتەكانی : كه بریتییه له دەربڕینی پیتێكی وەستاو بەبێ شەدده هاوكات له گەڵ مانەوەی مینگه له پیتی یەكەمدا .

*له لای هەندێك له زانا دێرینەكان بریتیه له تێهەڵكێشكردنی پیتی نوونی وەستاو و تەنوین له گەڵ مینگه , دەڵێن : شاردنەوه ئەوەیه كه له مینگه دەمێنێتەوه هەروەها فەرموویانه : پیتی نوون له گەڵ هەردوو پیتی واو و یا دەبێته مینگەیەكی شاراوەی تێهەڵكێش نەكراو , چونكه ئەگەر تێهەڵكێش بكرێت مینگەكه جێگیر نابێت .

بۆچوونی دووەمیش ئەوەیه كه جیاوازییەك له ڕووی شەدەدار كردنەوه له نیوانیاندا هەیه , چونكه شاردنەوه شەددەی نییه , بەلاّم تێهەڵكێش كردن هەیەتی .

*لەلای هەندێکی تر لە زانا دێرینەکان دەربڕینی لێ دەکرێت بەوەی کە بریتییە لە هێشتنەوەی هەندێك لە دەنگە تێهەڵکێش کراوەکە لەو پیتەی کە لە گەڵیدا تێهەڵکێش دەکرێت , وەکو هێشتنەوەی سیفەتی لکاندن لە فەرموودەی خوای گەورەدا : ( احطت ) النمل / 22 0

**20-اخفاء التعوذ:** واتە : شاردنەوەی پەناگرتن .

*الإسرار, واتە : دەربڕینی پەناگرتن ( الاستعاذة ) بە شێوەیەك کە کەسەکە خۆی گوێی لێبێت , ئەمەش بۆچوونی جومهوری زانایانە ( چونکە بە گشتی دەقی قسەی زانا دێرینەکان ئەوە دەگەیەنێ کە بکرێتە دژی ( جهر ) ئاشکراکردن, کەلەم حاڵەتدا پێویستە بە نهێنی بوترێت ).

*الکتمان : واتە : وتنی بەدڵ بەبێ دەربڕین .

**21-إخلاص الفتح :** بڕوانە : الفتح .

**22-الإخوان:** واتە : دووبراکە .

زۆربەی زانایان لەم زاراوەیە مەبەستیان لە ( حمزة الزیات ك د 156 ك ) و ( الکسائي ) یە ( كد 189 ك ) .

*مەبەست لە (إبن كثير المكي ك د 120ك ) و (ابو عمروالبصري ك د 154 ك ) ە .

**23-الأداء:** واتە : بەجێهێنان .

*(بەجێهێنانی پێشەوایانی قورئان خوێندن بۆ گەیاندنی قیرائەتێك بە ئێمە لە ڕێگەی گواستنەوەی لە وانەی پێش خۆیانەوە ).

*یان بریتییە لەوەی بە ڕاست و دروستی و لە ڕێگەی زۆرەوە پێمان گەیشتبێت , وەكو پایەكانی (مد) درێژكردنەوەی زیاد لەو بەشەی لە نیوان زانایاندا هاوبەشە , ئەمەو هاوشێوەكانیشی پاشكۆیە بۆ قیرائەتی (متواتر ) لە ڕووی حوكمەوە.

**24- الإدخال:** بڕوانە : الفصل .

**25-الإدغام:** واتە : تێهەڵكێشان .

*(دەربڕینی دوو پیت لە یەك پیتدا, بەشەددەداری وەكو پیتی دووەم ).

*لەلای هەندێك لە زانا دێرینەكان مەبەست پێی شاردنەوەیە لە ڕووی زیادەڕەوی دەستەواژەوە .

**26-الإدغام الصغير:**واتە : تێهەڵکێشانی بچووك .

(یەکەم پیت لە دووپیتەکە بزواو بێت , بەگەورە ناونراوە چونکە لە قورئاندا وێنەی زۆرە , چونکە بزواولەوەستاو زۆرترە تێیدا , هەروەها وتراوە : بە هۆی کاریگەری لە وەستاندنی بزواو پێش تێهەڵکێشکردنی , یان : بە هۆی ئەو گرانیەیی کە تێدایە , یان : بەهۆی ئەوەی هەردوو جۆرەکانی ( مثلین ) و ( جنسین ) و ( متقاربين ) دەگرێتەوە ).

**27- الإدغام الكبير:**تێهەڵکێشکردنیگەورە.

واتە: یەکەمی دوو پیتەکە جوڵاو بێت، هۆکاری ناونانەکەشی بە گەورە لەبەر زۆرییەتی لە قورئاندا، چونکە جوڵاو لە ڕاوەستاو زۆرترە لە قورئاندا، یان بە هۆی کاریگەرییەتی سەبارەت بە ڕاگرتنییتی جوڵاو پێش تێهەڵکێشکردنی، هەندێکیش وتوویانە لەبەر گرانێکەیەتی، یان لەبەر گشتگیرییەکەیەتی کە هەردوو جۆرەکانی لێکچوو و هاورەگەزو لەیەکتر نزیکەکان دەگرێتەوە.

**28-الأربع الزهر:**واتە چوار سورەتە پرشنگدارەکان .

ئەم زاراوەیە چوار سورەت دەگرێتەوە : ( القيامة , المطففين , البلد , الهمزة ) هەندێ لە زانایانی قیرائات ئەم سورەتانەیان جیاکردۆتەوە لە گەڵ پێشی خۆیاندا بەوەی کە ( بسم الله الرحمن الرحيم ) یان لە گەڵدا خوێندۆتەوە بۆ ئەو پێشەوایانەی کە ( سكت ) بێدەنگییان هەیە , هەندێکیش بێ دەنگییان بە دروست زانیوە بۆ ئەو خوێنەرەی کە هەردوو سورەتەکە بەبێ ( بسم الله الرحمن الرحيم ) لە نیوانیاندا دەخوێنێتەوە هۆکاری پەسەندکردنی ئەو بێ دەنگییەش بۆ خۆپاراستنە لە ناشرینی پێگەیاندیان , بۆیە جیاکردنەوەیان کردووە لە نیوان بە دوای یەکترهاتنی ( لا ) و ( ويل ) لە سەرەتای ئەم سورەتانە لە گەڵ ئەو سورەتانەی پێش خۆیان کە بەوشەی ( المغفرة ) کۆتایی پێهاتووە وەکو کۆتایی سورەتی ( المدثر ) پێش سورەتی ( القيامة ) و هەروەها وشەی مەزنی ( الله ) لە کۆتایی ( الانفطار ) پێش سورەتی ( المطففين ) یان ( جنتي ) لە کۆتایی ( الفجر ) پێش سورەتی ( البلد ) و , وشەی ( الصبر ) لە کۆتایی سورەتی ( العصر ) دا پێش سورەتی ( الهمزة ) ئەو سورەتانەش بە سوورەتە ڕووناك و پرشنگدارەکان ناونراون بە هۆی ناوبانگیان لە نیوان شارەزایانی ئەم زانستە , هەروەها بە ( الاربع الغر ) یش ناوبراون , بەڵام زۆربەی زانایان جیاوازیان نەکردووە لە نیوان ئەم

چوار سورەتەو سورەتەکانی تری قورئان سەبارەت بە حوکمەکانی (البسملة ) و ( الوصل ) و ( السكت ) دا .

**29-الأربع الغر:** بڕوانە : الاربع الزهر .

**30-الإرداف:** بڕوانە : الجمع .

**31-الإرسال :** ئازادکردن , یان فەرامۆش کردن .

*زانا دێرینەکان بە ( إسكان ياء الإضافة ) پێناسەی دەکەن , ئەوەش کە هەندێ لە نووسەرەکان دەیڵێن گوایە ئەم زاراوەیە لە لای زانا پێشینەکان بریتی بووە لە بزواندنی پیتی ( ی ) ی بۆ زیادکراو بە بزوێنی سەر ( فتحە ) ناگونجێت لە گەڵ ئەوەی کە لە کتێبی ئەو زانایانەدا هاتووە , بەڵکو ناگونجێت لە گەڵ بنەمای زمانەوانیشدا کە ( أرسل الشي أطلقه أو أهمله ) واتە : ئازادی کرد یان پشت گوێی خست .

( إسكان ) واتە : وەستاندنی پیتەکە و لادانی بزوێن لەسەرۆژێری .
خوای گەورەش زاناترە .

*( قصر المد ) : واتە خوێندنەوەی مەددی درێژ بە دوو جووڵە .

**32-أركان القراءة:واتە : كۆڵەكانی قورئان خوێندن .**

**گونجان و ڕێكەوتن لە گەڵ زمانی عەرەبی ئەگەر لە یەك ڕوویشەوە بێت , هەروەها گونجان و ڕێكەوتن لە گەڵ یەكێك لە موسحەفەكانی عوسمان ڕەزای خوای لێبێت ئەگەر ئیحتیمال و ئەگەریش بێت , هەروەها جێگیربوونی سەنەدەكەی و , جومهوری زانایانیش لەسەر ئەوەن كە ( تواتر ) مەرجێكی سەرەكییە .**

**33-الإزدواج فی الوقف :واتە : یەككگرتن لە ڕاوەستاندا .**

**( بریتییە لەوەی كەلەسەر هاوشێوەكەی دەوەستیٚ كە پەیوەندی بە پێشی خۆیەوە نەماوە لە ڕووی دەستەواژەوە بە هۆی یەككگرتنیان , وەكو ( لها ماكسبت ) البقرة / 134 , لەگەڵ ( ولكم ماكسبتم ) البقرة.141**

**34- الأسانید:سەنەدەكان .**

**ئەم زاراوەیە مەبەست لێی ئەو ڕێگایانەیە كە دەگات بە قورئان و شێوازەكانی خوێندنەوەی , پێك دێت لە زنجیرەیەك لەو كەسانەی كە خەریكی گواستنەوەی قورئان و لێكۆڵینەوەی شێوازەكانی خوێندنەوەی بوونە , هەمیشە زنجیرەی سەنەدی قورئان خوێنیش هەر نە پچڕاو بووە ,**

به تایبەتی له قیرائاتی عەشرەی (متواتر)دا , بەرزترین سەنەدیش کەوتبێتە نێوان قورئا نخوێنانی ئەم سەردەمەو پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه و سلم ) حەڤدە کەس بووە .

35-**الإستعاذة:** پەناگرتنە خوای گەورە .

دەست پێوەگرتن و پەنابردن , پێی دەوترێت (التعوذ ) نزایەکە چەندین شێوازی هەیە بەناوبانگترو لە پێشتریان لە لای پێشەوایانی قیرائات بریتییە لە : ( اعوذ بالله من الشيطان الرجيم ) بەیەك دەنگی زانایانیش لەسەرەتایخوێندنەوەدا بەشێك نیە لە قورئان.

36-**الأستفهام المكرر:**واتە : پرسیارکردنی دووبارەبوو .

کۆبوونەوەی دوو هەمزە لە یەك وشەدا, وشەیەکیش بە دوایدا بێت دوو هەمزەی تێدابێت , وەکو خوای گەورە فەرموویەتی (أءذا كنا ترابا أءنا ) الرعد /5.

37 - **الإسقاط:**بروانە : الحذف .

38-**الإسكان :** واتا لابردنی بزوێن لەسەر پیت .

داماڵینی پیت لە هەرسێ بزوێنەکان یان لە هەندێکیان , بە ( تسكين )
و ( جزم ) یش ناو دەبرێت .

39-**الإسناد**:بڕوانە : الأسانيد.

40- **الإشارة**:واتە ئاماژە .

*لە لای جومهور : ئاماژە بە ڕەوم و ئیشمام دەبێت .

*لەلای زانایانی بەسرە : بە واتای ( إشمام ) دێت بە شێوەیەك
شوێنەواری بزوێن لە دەربڕیندا نامینێ .

*لەلای زانایانی کووفە : بەواتای ڕەوم دێت کە بریتییە لە دەربڕینی
هەندێ لە بزوێنەکە .

41-**الاشارة الى الكسرة**:واتە : ئاماژە بۆ ژێر .

کەم دەربڕین ( تقليل ) لەنیوان سەر ( فتحه ) و ( اماله ) لارکردنەوە .

42-**الإشباع** :بەتێروتەسەل دەربڕین.

*بەجیهێنانی حوکمی داواکراو لە مەددە لاوەکییەکاندا زیاد لە بڕی مەددی ئاسایی .

*درێژکردنەوە بە ئەندازەی سێ ئەلیف ( شەش جووڵە ) .

*جووڵەکە زیاد بکەیت تاکو دەگاتە ئەندازەی ئەو پیتەی کە لێت وەرگرتووە .

*گەیاندنی پیتی های کینایە بە پیتی واو یان پیتی یاء لە دەربڕیندا .

*هەموو بزوێنەکانی ( ضمة ) و ( کسرة ) و ( فتحة ) وەکو خۆیان بەبێ هیچ کەمکردنەوەیەك بخوێنرێنەوە , ئەمەش ( إتمام ) ی پێ دەوترێت .

**43-الإشمام :**بۆن پێ کردن .

خڕکردنەوەی لێو لە پاش ساکن کردنی پیتەکە بەبێ دەنگ , زانایانی کووفە بەم حاڵەتە دەڵێن ڕەوم , شێوازەکەشی ئەوەیە هەردوو لێوت پاش دەربڕینی پیتەکە بەساکینی وەکو شێوەی ( ضمه ) کەی لێ بکەیت .

*تێکەڵکردنی بزوێنێك بە بزوێنێکی تر وەکو ( قیل ) البقرة / 11, لە خوێندنەوەی ئەو پێشەوایانەی بە ئیشمام دەیخوێننەوە , بە شێوازێك

کە یەکەم پیتی وشەکە بە بزوێنێکی پێکهاتوو لە دوو بزوێن بخوێنیتەوە : بۆروژێر , بەشی بۆرەکە لە پێشترە بەلاّم دەگمەنە , پاش ئەوە بەشی ژێرەکە دێت کە ئەوە زۆرجار ڕوودەدات , زۆرێکیش لە زانایانی پێشین هەر بە (ضمة ) بۆر دەربڕینی لێ دەکەن بەهۆی ئەو لێوخڕکردنەوەی کە لە پیتی ئیشمام کراودا , ڕوودەدات , وەکو چۆن بەلارکراوە ( حمال ) وتوویانە کەسرە , هەندێکیش لە زانایان بەڕەوم ناویان بردووە کە بریتییە لە هەوڵی تەواوکردنی و بەتەواو دەربڕینی دەنگەکە , چونکە تۆ لە سەرەتایی ئەوجۆرەو وشانەوە دەتەوێت بە تۆر (ضمة ) بخوێنیتەوە و دواتر دەچێتە سەر کەسرە و پیتی (ی) هەندێکی تریش لە زانایان بە ( اماله ) ناویان بردووە چونکە بزوێنەکە لە بۆرێکی تەواوەو نە ژێرێکی تەواوە, هەروەها لارکردنەوە (إمالة ) نەژێرێکی تەواوەو نە سەرێکی تەواوە , هەموو ئەم دەستەواژانەسەرەڕای جیاوازی وشەکانیان یەك ڕاستی دەگەیەنن لە دەربڕیندا , بە دانیشتنی قوتابیش نەبێت لەلای ماموستای شارەزا ڕوون نابێتەوە .

*تێکەڵکردنی پیتێك بە پیتێکی تر , وەکو( الصراط ) الفاتحة /6.

*یەکەم دەربڕین لە نیوان فەتحەو ئیمالەدا .

*شاردنەوەی بزوێنەکە ئەو کاتە لە نیوان ڕاوەستان و بزوێندا دەبێت . هەر ئەوەشە کە پێی دەوترێت ( أختلاس ) لە وشەی ( ارنا ) مصلت 29.

لەگەڵ هاوشێوەکانی بە پێی عەمر لە هەندێ ڕێگاکانی , هەروەها بە شێوازی شاردنەوە لە وشەی ( تأمنا ) یوسف /11.

*بزواندنی پیتی ( ه ) ی کینایە بەبێ ( صله ) درێژکردنەوە .

**44-إشمام الكسرة:**بڕوانە الامالە.

**45-الأصحاب:**هاوەڵان .

ئەم زاراوە یە سێ پێشەواو دەگرێتەوە : ( حمزه الزيات ك د 156 ك ) , الكسائى ( كد 189ك ) خلف البزار ) (ك د 229ك )

**46-أصحاب الاختيارات:**بڕوانە : الاختيار .

**47-الأصل :**بڕوانە : الأصول .

**48-الإصمات:**بڕوانە : المصمتة .

**49-الأصول:**بنەماكان .

تاكەكەی ( اصل ) ە , حوكمەكەی لەسەر یەك شێواز جێگیرە , بریتییە لەو بنەما گشتیانەی كە جێ بەجێ دەبێتە سەر باسە لاوەكیەكانی سەر بەو بنەمایانە , وەكو تێهەڵكێشان و لاركردنەوەو شتی تر , بەبنەما (قاعدە ) و ڕێرەو (مذهب) ناو دەبرێت , دەوترێت : فلاَنە كەس ئەوەی خوێند بە پێی بنەماكانی , واتە : بە پێی بنچینەو ڕێرەوەكەی .

50-**الإضجاع**:بڕوانە : الإمالة .

51-**الأضداد**:دژە یەكترەكان .

مەبەست لەم زاراوە یە ئەو كۆتانە یە كە ئەوو شانەی قورئانی پیێ دیاری دەكرێت كە ناكۆكیان لە سەرە , بۆ نموونە تێهەڵكێشان دژەكەی دەرخستنە , دەرخستنیش دژەكەی تێهەڵكێشانە , زانایانی قیرائاتیش وا ڕا هاتوون كاتێك باسی یەكێك لە دژەكان دەكەن بۆ خوێندنەوەی پێ شەوایەك ئیتر باسی دژەكەی تری ناكەن بۆ پێشەوایانی تر .

52-**الإظهار** :دەرخستن .

**دابڕینی پیتی یەکەم لەو پیتەی کە دوای خۆی دێت بە شێوازێك ئاشکرای بکات بەبێ ( سکت ) بێ دەنگی .**

**بە دەستەواژەیەکی تر : ( هەردوو پیتەکە دەربېڕدرێن بە شێوازی خۆیان بەتەواوی سیفەتەکانیان بە باشی و بە پاکی شایانی باسە ( الاظهار ) لە هەمان کاتدا بە ( البيان ) و ( التبين ) و ( المبين ) ناودەبرێت .**

**53-الإعتبار : پەسەندکردن .**

**کورت کردنەوەی مەددی جیاواز ( المنفصل ) بۆ دوو جوڵە , چونکە هەندێ لە زانایان پیتی مەددولین لە گەڵ هەمزە دادەنێ , جا ئەگەر لە یەکتر جیاوازبوون لە مەددی ئاسایی زیاتری پێ نادات .**

**54-الإفراد :تەنیاخستن :**

**خوێندنەوەی قورئان بە یەك ڕیوایەت بێ ئەوەی ڕیوایەتێکی تری لە گەڵدا بخوێنێ لە یەك خەتمەدا .**

**55-الإفراد :بڕوانە : الإنفراد.**

**56- الألف : پیتی ئەلیف .**

*یەکێکە لە پیتەکانی مەدد .

*لەلای زانا دێرینەکان : پیتی هەمزەیە .

## 57-ألف التأنيث: پیتی ئەلیفی مێینە .

هەموو پیتێ کی ئەلیفی زیادە  چوارەم پ یت بەرەو سەرەوە  ئاماژە بۆ مێینە یەکی ڕاستەقینە یان خوازەیی ( مجاز ) بکات , لە ( فعلى ) دروست دەبێت , ئیتر چی پیتی ( ف ) سەر یانژێر یان بۆری هەبێت وەکو ( نجوى ) ( دنيا ) ( إحدى )

## 58 - الف الترخيم: پیتی ئەلیفی نەرم .

مەبەست لە ئەلیفی لارکراوە ( ممال ) ە , بۆیە ئەو ناوەی لێ نراوە چونکە تەرخیم واتە : نەرم کردنەوەی دەنگ .

## 59-الألف المفتوحة : ئەلیفی فەتحەدار .

ئەلیفی ڕەسەن کە لە نیوان ( إمالة ) و ( تفخيم ) دا دەبێت .

## 60-الألف المفخمة: ئەلیفی قەڵەو .

ئەلیفێكە دەربڕینەكەی قەڵەوكردنێكی لە گەڵدا تێكەڵ دەبێت لە پیتی واو نزیكی دەكاتەوە , وەرش كد197ك) لە (نافعكد169ك) بەم شێوەیە خوێندوویەتی وەكو وشەی ( الصلاة ).

61-إمالات قتيبة: لاركردنەوەكانی قوتەیبە .

مەبەست لەم زاراوەیە ئەو لاركردنەوانەیە كە تەنها لە ڕێگەی (قتيبە بن مهران ) لە (الكسائي ) هاتووە , ئەو هەموو ئەلفێكی لار دەكردەوە كە پێشی یان پاشی كەسرە بوایە , یان كۆتایی ئەو وشەی كە بە كەسرە تەواو دەبێت , یان سەرەتای ئەو وشەی كە ئەلیفێكی كەسرەدار بووایە , ئەم جۆرە لاركردنەوانەش لە زۆرێك لە كتێبەكانی قیرائات ڕیوایەت كراوە , بەلاّم لەم ڕۆژگارە بەو شێوە ناخوێنرێتەوە چونكە ئەمڕۆ زنجیرەی سەنەدەكان ناگەن بە كیسائی لەو ڕیوایەتەوە ناموٚكان (القراءات الشاذة ) دەژمێردرێت .

62-الإمالة: لاركردنەوە .

*نزیك كردنەوەی سەر لە ژێرەوە و ئەلیف لە یائەوە بەبێ هەڵگێڕانەوەی تەواو یان بەلاركردنەوەی تەواو (الإمالة الكبرى ) , لە لای زانایانی پێشین بە (الكسر ) و (الياء ) و (الإضجاع ) و(البطح )

و (اللّي ) و (إمالة شديدة ) و (إمالة محضة ) و (إمالة خالصة ) و (إمالة تامة ) و (إشمام الكسر ) ناوبراوە .

*لای هەندێكی تریشلە زانا دێرینەكان بە (إشمام حركة بحركة ) واتە تێكەڵكردنیجووڵەیەك بە جووڵەیەكی تر , وەكو (قيل ) لە خوێندنەوەی ئەو پێشەوایانەی بە ئیشمام دەیخوێننەوە .

63-إمالة تامة:بڕوانە : الإمالە 0

64- إمالة خالصة:بڕوانە : الإمالە 0

65-إمالة شديدة:بڕوانە : الإمالە 0

66-إمالة صغرى: بڕوانە : التقليل 0

67- إماله ضعيفة:بڕوانە : التقليل 0

68-إمالة غير خالصة: بڕوانە : التقليل 0

69-إمالة كبرى:بڕوانە : الإمالە 0

70- إمالةلطيفة: بڕوانە : التقليل 0

71-**إمالة متوسطة :**بڕوانه التقليل 0

72-**إمالة محضة:**بڕوانه : الإمالة0

73- **إمالة وسطى:**بڕوانه : التقليل 0

74- **إمالةيسيرة :**بڕوانه : التقليل 0

75-**الإنفراد :** بڕوانه : الإنفرادة 0

76-**الإنفراد:**بڕوانه : الإنفرادة .

ئەم زاراوەيە ئەو شێوازانەی قیرائات دەگرێتەوە کە دەدرێنە پاڵ یەکێك لە پێشەوایانی قیرائات یان یەکێك لە گێڕەرەوەکانیان یەکێك لە ڕێگاکانیان , هەندێ لەو شێوازانەش نامۆن , هەندێکێشیان ڕاست و درووستن و لە زۆر ڕێگەوە ڕیوایەت کراون , لە هەمان کاتدا بە ( التفرد ) و ( الإنفراد ) و ( الإفراد ) یش ناو دەبرێن 0

77-**أهل الأداء :** پێشەوایانی شارەزای قیرائات 0

78-**أهل البصرة:**بەسرەییەکان 0

مەبەست لەم زاراوەیە (أبو عمرو البصري ) یەکێکە لە حەوت پێشەواکانی قیرائات , هەروەها (يعقوب الحضرمي كد205ك ) ئەم دوو پێشەوایەش بە (البصرى ) یان (البصريان ) ناو دەبرێن جا ئەگەر (الحسن البصريكد11ك ) بێتە پاڵیان,هەروەها ( يحيى اليزيدي ك د 202 ك )لە چواردە پێشەوایانی قورئا نخوێنن پێیان دەوترێت (البصريون )

## 79-أهل الحجاز: حیجازییەکان

لە حەوت پێشەواکان (أبن كثير المكي ك د 120 ك ) و (نافع المدني ك د 2169ك ) دەگرێتەوە , پێکەوە پێیان دەوترێت (الحجازيان ) , لە دە پێشەواکانیش ( أبو جعفر المدني ) و , لە چواردە پێشەواکەیش (أبن محيصن المكيك د 123 ك ) دەگرێتەوە , هەمووشیان بە (الحجازيون ) یان ( حجازي ) دەناسرێن .

بەلای هەندێ لە پێشەوایانیش وشەی ( حجازى ) بۆ (أبو عمروالبصري ) و ( يعقوب الحضرمي ) بەکار دێت ئەگەر خوێندنەوەکە یان وەکو خوێندنەوەی (الحرمين ) بوو , چونکە ئەبو عەمر لە مەککە لە دایك بووەو یەعقوبیش شوێن کەوتووی ئەوە چونکە جۆری خوێندنەکەی لە ئەوە وەرگرتووە .

## 80-أهل العالية :( حجاز و دەوروبەری )

ئەم زاراوەیە بە (ابن عامر الشاميك د 118ك) دەوترێت ئەگەر شێوازی خوێندنەوەکەی لە گەڵ (أهل الحرمين ) یەکی گرت , مەبەست لە عالیە حیجاز و ئەو شوێنانە یە سەر بەحیجازە,هەروەها پێیان دەوترێت (علوي )

## 81-أهل العراق :عێراقیەکان .

بە ئەهلی کوو فەو بە سرە دەوتر یێت , لە هەمان کا تدا دەوترێت (العراقيون ) و (عراقي ).

## 82-أهل الكوفة :کووفییەکان .

ئەم زاراوەیە لەحەوت پێشەواکان (عاصم بن أبي النجودك د 127 ك ) حمزه الزيات ك د 156ك ) و (الكسائي ك د 189 ك) دەگرێتەوە , لە نێو دە پێشەواکە یش (خلف البزار ك د229ك) دەگرێتەوە , لە چواردە پێشەواکەیش (الاعمش الكوفى ك د 148ك) دەگرێتەوە , پێشیان دەوترێت : (کوفي ) و (الكوفيون ) و (كوف) .

## 83-أهل المدينة :مەدینەییەکان .

ئەم زاراوەیە مەبەست لێی (نافع المدني ) یە لە نێو حەوت پێشەواکە . لە دە پێشەواکەیش مەبەست لێی (ابو جعفر المدنى ) یە , بە هەردووکیشیان دەوترێت : (مدني) و (المدنيان )

84-**أهل مكة**:بڕوانە : المكي .

85-**أواخر الآي**:بڕوانە رؤوس الآي .

86-**أوقاف**:بڕوانە : الوقف .

87- **الأولان** :هەردوویەکەمەکە .

بە ( عاصم بن ابى النجود ) و ( حمزة الزيات ) دەوترێت .

## پیتی ( ب )

88-**البتر**:بڕین .

پایەیەکە لە ( قصر ) کەمترە, بڕیتییە لە لابردنی پیتی مەدد , ئەمەش بە نامۆ ( شاذ ) دادەنرێت وجائیزنییە قورئان بەو شێوەیە بخوێنرێتەوە.

89-**البدل** :

دانانی پیتەکانی ئەلیف و واو لە جێگەی هەمزە وەکو قەرەبوو .

90-**البسملة**:وتنی ( بسم الله الرحمن الرحيم )

بریتییە لەوەی خوێنەری قورئان بڵێت (بسم الله الرحمن الرحيم ) مامۆستا بە قوتابی دەڵێ : (بسمل وسم ) واتە : بڵێ (بسم الله الرحمن الرحيم ) , ئینجا (التسمية ) و (البسملة ) بە هەمان واتا دێت .

91-**بصري**:بڕوانە : اهل البصرة .

92-**البصريان** : بڕوانە : اهل البصرة .

93-**البصريون**: بڕوانە : اهل البصرة .

94-**البطح**:بڕوانە : أهل الإمالة .

95-**البنون**:بڕوانە : الإبنان .

96-**البيان**:بڕوانە : اهل الإظهار .

97-**بين الإمالة والتفخيم**:بڕوانە : التقليل .

98-**بين الإمالة والفتح** :بڕوانە : التقليل .

99-**بين الكسر والتفخيم**:بڕوانە : التقليل .

100-**بين الكسر والفتح**:بڕوانە التقليل .

101-**بين اللفظين** :بڕوانە :التقليل .

102- **بين بين**: لە نێوەنددا

دەربڕینی پیتی  هەمزە لە نیوان خۆی و پیتێك لە ڕەگەزی بزوێنەكەی ئەلیف دابێت , پیتی كەسرەدار یشلە نێوان هەمزەی جێبەجێكراو یائیكی ( مدي ) درێژكراو بێت و پیتی ( ضمة ) داری شلە نیوان هەمزەو واوێكی ( مدي ) درێژكراوەبێت .

*بەكەم دەربڕین ( التقليل ) كە بریتییە لە لاركردنەوەی بچووك ( الإمالة الصغرى ) واتە لە نیوان فەتحەو لاركردنەوەدا , كە لە هەمان كاتدا لە لای هەندێك لە زانایان بە ( بين بين ) ناو دەبرێت لە بابەتی ناسك كردنەوەی پیتەكانی ڕا , چونكە جیاوازی لە دەربڕیندا هەیە لە نیوان ناسكردنەوەو لاركردنەوەدا .

## پیتی ( ت )

103-**تاء التأنيث** :بڕوانە : هاء التأنيث .

104-**تاءات البزي**:تائەكانی پێشەوا بەززی .

ئەو پیتانەی ( ت ) کە دەکەونە سەرەتای کرداری ڕانەبردوو , ئەگەر گونجاوبێت تائێکی تریان لە گەڵ بێت و لە موسحەفیشدا نەنووسرابێت وەکو : ( تیمموا ) کە بنچینەکەی ( تتیمموا ) ە ( البزيك د 250ك ) لە قیرائەتی ( ابن کثیرك د 120 ك ) بەشەددار کردنی ئەو پیتە خوێندوویەتی لە کاتی بەردەوامیدا , ژمارەی ئەو تائانە ( 31 ) یان ( 33 ) جار لە قورئاندا هاتوون .

**105-التاءات المفتوحة:** پیتەکانی ( ت ) ی فەتحەدار .

پیتی ( ه ) ی مێینە کە لە موسحەفدا بە ( ت ) نووسرابێت , هەندێ لە زانایان بە ( ه ) ڕادەوەستن لە سەری وەکو بنەمایەکی گشتی ئیتر ئایا بە ( ه ) نووسرابێت یان بە ( ت ) , بەڵام هەندێ لە پێشەوایان تەنها بە ( ت ) لە سەری ڕاوەستاون وەکو جیاوازی کردن لە نیوانیان .

ئەووشانەی بە( ت ) نوسراون لە گەڵ ئەو وشانەی کە بە ( ه ) نووسراون وەکو شوێنکەوتنێك بۆ ڕەسمی قورئان .

**106- تابعه :** بڕوانە : وافقه .

**107-التتميم:** تەواوکردن .

مەبەست لەم زاراوەیە درێژکردنەوەی پیتی میمی کۆ , لەلای پێشەوا (ابن كثير ) و ئەوانەی بەو شێوازە دەیخوێننەوە .

## 108-التثقيل:قورسکردن .

جێگای دەرچوونی پیتی دەربڕدراوە بە شەددەداری بە هۆی قورس بونی لە سەر ئەو کەسەی دەریدەبڕێت , وەکو (اياك )

*درێژکردنەوەی پیتی (ه) ی (كناية ) لە لای (ابن كثير ) و هەندێ زانایانی تر .

*درێژکردنەوەی پیتی (م ) ی کۆ لە لای (ابن كثير ) و هەندێ پێشەوای تر .

*ئەوەی کە ناوڕاستی بۆر (ضمة ) ی هەبێت , بۆ نموونە : (اليُسر )( العُسر) ئەوەش لە کاتی ساکن کردندا بە کاردێت ئەگەر بە سووکی دەربڕدرا .

*ساکن کردنی ئەو پیتانەی (ي ) کە بە ( ياءات الاضافة ) دەناسرێت .

## 109-التحريرات: ڕوونکردنەوەی شێوازەکانی خوێندنەوەی قیرائات

زانستێکە گرنگی دەدات بە شێوازەکانی قیرائات کە جیاوازییان تێدایە و

دەیانگێڕێتەوە بۆ سەرچاوەکانیان , هەروەها بایەخ دەدات بە جیاکردنەوەی ڕێگاکان وبژارکردنیان و , ئاشکراکردنی ئەو شێوازانەی کە جائیزن یان قەدەغەکراون و ئەوەش بە پێی ئەو بنەمایانە دروست دەبن .

110-التحريك :بزواندن .

ئەم زاراوە ئەوە دەگەیەنێت کە هەرسێ بزوێنەکانی سەروژێرو بۆر بە تەواوی و بەبێ ( اختلاس ) بخوێنرێنەوە .

111-التحقيق :جێبەجێکردن .

دربڕینی هەمزە بە شێوەی خۆی بە تەواوی لە ڕووی سیفەت و جێگای دەرچوونەوەکە دەکەوێتە ئەو پەڕی گەروو .

112-تحويل الهمزة :بڕوانە : الإبدال .

113-التخفيف :سووکردن .

ئەو وشەی کە بزوێنی ناوڕاستەکەی لابراوە بەو هۆیەشەوە سووك بووە , وەکو ساکن کردنی پیتی لام لە فەرموودەی خوای گەورە ( غلف ) 88/البقرة , هەروەها ساکن کردنی , پیتی ( س ) لە فەرموودەی خوای

گەورە : ( مع العسر يسرا ) الشرح /6 , بەلاَم ئەگەر ئەم ساكينە بزوێنی هەبێت ئەوە بە قورسكراو دادەنرێت .

*هەر گۆڕانكاريەك بەڕەهايی , ئەمەش هەموو جۆرەكانی سووكردنەوە دەگرێتەوە وەكو ئاسانكردن ( تسهيل ) و مام ناوەندی ( بين بين ) و گۆڕين ( ابدال ) و لابردن ( حذف ) .

*سووككردنی هەمزە بەشێوەيەكی مام ناوەندی .

*لابردنی درێژكردنەوەی پيتەكانی ( ه ) .

*هەڵوەشاندنەوەی پيتی شەددەدار .

*بەفەتحەكردنی پيتەكانی ( ياءات الاضافة )

**114-التخفيف الرسمي :**سووكردنەوەی ڕێنووسی قورئانی .

ئەم زاراوەيە بريتييە لەوەی كە هەندێ لە پێشەوايان وەكو حەمزەو ئەوانەی لە گەڵيدان , ڕادەوەستن لە سەر پيتی هەمزە بە پێی نووسينی موسحەفی عوسمانی , لەو بارەشەوە پشتيان بە ڕيوايەت بە ستووە .

**115-التخفيف القياسي :**سووكردنەوەی پێوانەيی .

بریتیه لەوەی کە جومهوری پێشەوایانی قیرائات و زانەوانی لەسەری پێکهاتوون لە مەسەلەی سووك ڕاوەستان لە سەر پیتی هەمزە لە ڕێگەی پێشەوا حەمزەو ئەوانەی لە گەڵیدا هاوچوونن .

116-**التخليص**:بڕوانە : فك الحروف .

117-**التدبير** : سازاندن .

گۆڕینی هەمزە بۆ جۆری جووڵەکەی یان جووڵەی پیتی پێشی خۆی . یان بە هەردووکیان پێکەوە , جا هەمزەی سازێندراو لە لای ئەوانەی دەیگۆڕن وەکو هەمزەی دووەمە لە (يشاء إلى) البقرة / 142. زۆرینەی پێشەوایان پێیان وایە هەمزەی دووەم پێویستە بکرێتە واوێکی پەتی , بۆیە بە بزوێنی خۆی و پێشی خۆی سازاندیان , هەندێکی تریشلە پێشەوایان هەمزەی دووەمیان (تسهيل ) ئاسان کردووە بە شێوازێك لە نیوان هەمزەو (ه) بێت , لەو حاڵەتەشدا تەنها بە بزوێنەکەی خۆی سازاندیان .

118-**الترجيح بين القراءات**:بەراورد لە نێوان قیرائەتەکاندا .

فەزڵدانی قیرائەتێك بە سەر قیرائەتێکی تردا بەلای جومهوری زانایانەوە جائیزە , هەڵبژاردنەکانیش لەو بارەوە بە ناوبانگن , بە گشتیش هەڵبژاردنیان لە قیرائەتێکدا بە هۆی کۆبوونەوەی سێ شت

دەبێت : بەهێزیی ڕێگەکەی لە زمانی عەرەبی و , گونجانی لە گەڵ شێوازی نووسینەوەی موسحەف و کۆبوونەوەی پێشەوایانیقیرائات لەسەر ئەو شێوازە خوێندنەوە , ئەوەشیان بەمەرج داناوە کە پەسەندکردنی قیرائەتێك نەبێتە مایەی نکۆڵی کردن لە قیرائەتێکی تر یان لابردنی , ئەگەر لە نێو قیرائەتە ( متواتر ) ە کاندا بێت .

119- **الترقيق** :ناسك کردنەوە .

واتای ئەم زاراوەیە بریتییە لە لاوازییەك تووشی پیتەکە دەبێت کە دەبێتە مایەی دەنگ نەدانەوەی لە ناو دەمدا , دوو جۆریشی هەیە : ناسکردنەوەی پیتی ڕائی فەتحەدار , یا بە پیتێك کە فەتحەی نەبێت , کەبریتییە لە لارکردنەوە ( إمالة ) بە هەموو جۆرەکانی , چونکە هەموو ( إمالة ) یەك ناسك دەکرێتەوە نە ك بە پێچەوانە .

120- **ترك الهمزة**:وازهێنانی لە هە مزة .

ئەم زاراوەیە هەموو سووککردنەوەیەکی هەمزە بەرەهایی دەگرێتەوە .

121- **تركيب القراءات** :تێکەڵکردنی قیرائات .

گواستنەوە لە قیرائەتێك بۆ قیرائەتێكی تر لە كاتی قورئان خوێندنەوەدا بەبێ دووبارەكردنەوەی شێوازەكانی جیاوازی , یان بەبێ پابەندبووون بە ڕیوایەتێكی دیاریكراو ,بۆ نموونە لە جێگەیەك (وهو ) بە ساكین كردنی (ه ) و لە جێگەیەكی تربە (ضمة ) بخوێنرێتە ئەم كردارە پێشی دەوترێت : (الخلط ) و (التلفيق ) .

سەبارەت بەجائیز بوونیشی زانایان ناكۆكییان لە نیواندا هەیە .

122- **تسبيع القراءات:** كورت هەڵهێنانی قیرائات لە سەر حەوت قیرائەت ئەم زاراوەیە ئەوە دەگەیەنێ كە پێشەوایانی قیرائات حەوتن یەكەم كەسیش لەم ژمارە دیاریكردن پێشەوا (ابن مجاهد ك د 342ك )بوو .

123- **التسكين :** بڕوانە : الإسكان .

124- **التسمية:** بڕوانە : البسملة .

125- **التسهيل :** ئاسانكردن .

هەمزە بخرێتە نیوان خۆی و پیتی گونجاو لە گەڵ بزوێنەکەیدا , بۆ نموونە هەمزەی فەتحەدار لە نیوان هەمزەی جێبەجێکراو و ئەلیف بخوێنرێتەوە , هەمزەی کەسرەداریش لە نیوان هەمزەی جێبەجێکراو و یائی درێژکراو بخوێنرێتەوە , هەمزەی ( مضموم ) یشلە نیوان هەمزەو واویدرێژکراو بخوێنرێتەوە , ئەمانەش کە باسکران تەنها لە ڕێگەی مامۆستای شارەزاوە قوتابی دەتوانێت فێریان ببێت , لە کاتێکدا ئەمانە بەناوبانگترین و زۆرترین بەکارهاتووی واتای ئاسانکردن ( تسهیل ) ن .

**126-التضعیف :** شەددەدارکردن .

شەددەدارکردنی کۆتایی وشە لە کاتی ڕاوەستان لەسەری ,کەس لە پێشەوایانی قیرائات کاری پێ نەکردووە جگە لەوە نەبێت لە ڕیوایەتێکی نامۆ ( شاذ ) هاتووە لە ڕێگەی ( عصمة بن عروة ) لە ( عاصم بن أبي النجود ) کە گوایە ئەو لەسەر فەرموودەی خوای گەورە ( مستطر ) القمر / 53, بە شەددەی پیتی ( ر ) دەوەستا , لە قیرائەتێکی نامۆی تریشدا لە (ابن كثير ) ەوە هاتووە کە لەسەر وشەی (الامد) بە شەددەدارکردنی پیتی ( د ) ڕادەوەستا .

**127-التعوذ :** بڕوانە : ألإستعاذة .

128- **التفخيم :** قەڵەوکردن .

ئەم زاراوەیە لە لای پێشەوا دێرینەکان بە ( فتح ) دەوترێت بەو واتایەی کە دژی لارکردنەوە ( إمالة ) بێت .

129-**التفخيم المحض :**بڕوانە : الفتح الشديد .

130-**التفرد :**بڕوانە : الإنفرادة .

131- **التقليل :**بەکەم دەربڕین .

دەربڕینی ئەلیف لە بارێکدا بێت لە نیوان فەتحەو لارکردنەوەی گەورە ( الإمالة الكبرى ) , پێی دەوترێت لارکردنەوەی بچووك ( الإمالة الصغرى ) یان ( بين بين ) یان ( بين اللفظين ) , زانا دێرینەکانیش بەم زاراوانەی دادێت ناویان بردووە , ( التلطيف ) ( الملطف ) ( الترقيق ) ( إمالة متوسطة ) ( إمالة وسطى ) ( إمالة يسيرة ) ( إمالة ضعيفة ) ( إمالة لطيفة ) ( بين بين ) ( بين الكسر و التفخم ) ( بين الكسر والفتح ) ( بين الإمالة والفتح ) ( بين الإمالة والتفخيم ) ( بين الكسر والفتح ) ( بين الإمالة والفتح ) ( بين الإمالة والتفخيم ) و ( إمالة غير خالصة ) .

132- **التكبير :**وتنی ( الله أكبر )

ئەم زاراوەیە لە قیرائات بە واتای ئەوە دێت خوێنەری قورئان پێش (بسم الله الرحمن الرحیم ) (الله أكبر ) بكات , شێوازیشی هەیە لەم دوو وشەیە زیاترە , پتر ئەوە بە ناوبانگە کە لە سورەتی (الضحی ) وە دەست پێ دەکات , بۆچوونێکیش هەیە دەڵێت لە هەموو قورئاندا دەکرێت , بە کۆی ڕای زانایانیش بەشێك نیە لە قورئانی پیرۆز , بەڵام سونەتێك و شوێنەوارێکە لە زانایانی مەککەوە بەجێ ماوە , کەسانی تریش ڕیوایەتیان کردووە , هیچ پێشەوایەکیش وتنی (الله أكبر ) ی بە مەرج دانەناوە ئە نجام بدرێت .

133- **التلطيف :**بڕوانە : التقليل .

134-**التلفيق :**بڕوانە : تركيب القراءات .

135- **التليين :**بڕوانە : التسهيل .

136-**التمكين :**بڕوانە : مد التمكين .

137-**توجيه القراوات :**زانستێکە گرنگی دەدات بەئاشکراکردنی شێوازەکانی قیرائات لە ڕووی زمانەوانی و تەفسیر , ڕوونکردنەوەی هەڵبژاردراوەکانیان و پێی دەوترێت (علل القراءات ) و (حجج القراءات ) و (الاحتجاج للقراءات ) , بەڵام (التوجية ) زاراوەی پەسەندە ,

دەوترێت : فلاٌنە شێواز , نەوەك كەسێك وا گومان ببات كە جێگیربوونی قیرائەتێك ڕاوەستاوە لەسەر ڕاستی ڕوونكردنەوەی شێوازەكەی .

138-التوحيد:كردنەیەك .

بەتاك كردن وەكو ( الريح ) لە بەرامبەر ( الرياح ) .

139-توسط المد:مەددی مام ناوەندی . پلەیەكە لە نیوان مەددو ( قصر ) دا , پێشی دەوترێت ( الوسطى ) ( التوسط )

## پیتی( الثاء )

140-الثلاثة :سێ پێشەواكە .

مەبەست لەم زاراوەیە ( أبن كثير المكي ) و ( أبى عمرو البصرى ) و ( نافع المدنى ) .

## 141-ثوى:

هێمایەكە لە ( طيبة النشر في القراءات العشر ) ئاماژەی پێ دەكرێت بۆ ( أبو جعفر المدني ) و ( يعقوب الحضرمي ) .

## پیتی ( ج )

## 142-الجماع :كۆكردنەوە

كۆكردنەوە كە دژی تەنیا خستنە , وەكو ( آية ) و ( آيات ) .

## 143-الجماعة :كۆمەڵ .

*كۆمەڵی قورئانخوێنان , كاتێك ئەم زاراوە دەیانگرێتەوە كە پێكەوە بن یان لەسەر مەسەلەیەك كۆك بن , هاوكات بە زۆرینە یان جمهوریان دەوترێت .

*ئەو كۆكردنەوەی كە دژی تەنیاخستنە , وەكو ( ثمرة ) ( ثمرات ) .

## 144- الجمع : كۆكردنەوە .

خوێندنەوەی قورئان بە زیاتر لە ڕیوایەتێك لە یەك خەتمەدا , کاری پێ دەکرێت لە کاتی فێرکردندا بە پێی هەندێ مەرج و حوکمی شیکراوە خۆرئاواییەکان (المغاربة ) بە (الارداف ) ناساندویانە , چونکە شێواز لە پاش شێواز دەخوێندرێت , سەبارەت بە شێوەی وەرگرتنی جۆراو جۆر هەیە .

**الجمع بالحروف : کۆکردنەوە بە پێی وشەکە قیرائاتی تێدایە .**

لەم جۆرەدا خوێنەر دەست دەکاتە قورئان خوێندن , جا کاتێك بەسەر بابەتێکدا تێدە پەڕێت کە جیاوازی تێدایە دووبارەی دەکاتەوە تاکو بە پێی ئەو جیاوازیانە دەیا نخوێنێ , ئەگەر وەستاو لەسەری گونجاو بوو ڕادەوەستێ و لە پاشی ئەو وشەوە دەست پێدەکات ئەگەر نا دەیداتە دەم کۆتا شێوازی جیاوازی کە خوێندوویەتی .

**الجمع بالوقف : کۆکردنەوە بەڕاوەستان .**

لەم جۆرەدا خوێنەر یەك بەیەك شێوازەکانی قیرائاتە جیاوازەکان دەخوێنێتەوە بە پێی ڕاوەستان بۆ هەموو پێشەوایەك بەتەنها خۆی واتە بەردەوام دەبێت تاکو دەگاتە شوێنێکی گونجاو بۆ ڕاوەستان و دەست پێکردن لە پاشیەوە , ئینجا دەگەڕێتەوە سەر خوێنەرێکی تر ئەگەر لە خوێندنەوەی پێشوودا نەیگرتبێتەوە .

**الجمع بالآية : کۆکردنەوە لە ڕێگەی ئایەتەکانەوە .**

ئەم جۆرە لە کۆکردنەوە بریتیە لەوەی شێوازەکانی جیاوازی یەك بەدوای یەکدا بخوێنێتەوە , هەروەکو کۆکرنەوەی ڕاوەستان بەلاَم لەم حاڵەتەدا هەموو ئایەتێك بەسەر بەخۆیی , واتە : ئایەتێك بە قیرائەتێك دەخوێنێتەوە تاکو کۆتایی , پاشان دەگەڕێتەوە بۆ قیرائەتێکی تر لە هەمان ئایەتدا تاکو تەواو دەبێت ئینجا دەچێتە سەر ئایەتێکی تر .

**الجمع بالتوافق : کۆکردنەوە بە ڕێکەوتن .**

واتە : خوێنەر دەست دەکاتە قورئان خوێندن بە ڕیوایەتێك , ئینجا تەماشا دەکات کام لە پێشەوایانی قیرائات لەگەڵ ئەو ڕیوایەتە ڕێك دەکەون , جاکاتێك دەگاتە وشەیەك لە نیوان هەردوو ڕیوایەتەکە جیاوازی تێدابێت لەسەر ڕادەوەستێت و یەکیان دەخات , ئینجا بەردەوام دەبێت تاکو دەگاتە ڕاوەستانێکی گونجاو , تاکو جیاوازییەکە تەواو دەبێت .

**الجمع بالتناسب : کۆکردنەوە بەسازان .**

واتە : خوێنەر دەست بکات بە خوێندنەوەی قورئان بە ڕیوایەتێك , ئەگەر بە (قصر ) دەستی پێکرد دواتر دەچێتە سەرپایەی دوای ئەوە تاکو دەگاتە کۆتایی پایەکانی درێژکردنەوە , یان ئەگەر بە (فتح)

دەستی پێکرد دوای ئەوە دەچێتە سەر لارکردنەوە ی بچووک ( الإمالة الصغرى ) ئینجا دەچێتە سەر لارکردنەوەی گەورە ( الإمالةُ الكبرى ) ئیتر بە هەمان شێوە لە هەموو جۆرێکدا بەو شێوەی کەدەسازێت لە گەڵی .

## پیتی ( ح )

145-**الحاجز :** بڕوانە : الفاصل .

### 146-الحال المرتحل :

ئەوکەسەی دەست دەکاتە خەتمەیەکی تازە پاش تەواوبوونی لە خەتمەی پێشوو , پێی دەوترێت ( حال ) واتە : دەستی کردووە بە خەتمەیەك ( مرتحل ) واتە : دەستی هەڵگرتووە لە خەتمەیەکی تر , ئەمەش لەو کاتە دروست دەبێت کە خوێندنەوەی سورەتی ( الناس ) تەواو دەکات و دەست دەکات بە خوێندنەوەی سورەتی ( الفاتحة ) و پێنج ئایەت لە سەرەتای سورەتی ( البقرة ) بە پێی ژماردنی ( الكوفي ) تاکو : ( المفلحون )

147-**الحَبر:**زانای چاك :

ئەمە زاراوەیەكە لە كتێبی (طيبة النشر في القراءات العشر ) ئاماژەیە بۆ (ابن كثير المكي )(ك د 120 ك ) و (ابو عمروالبصرى ك د 154 ك )

**148-حجازي :** بڕوانە : اهل الحجاز .

**149-الحجازيان :** بڕوانە : اهل الحجاز .

**150-الحجازيون :** بڕوانە : اهل الحجاز .

**151- حجج القراءات :** بڕوانە : توجيه القراءات .

**152-الحذف :** لابردن .

واتە لابردنی پیتێك بێ ئەوەی هیچ لە جێگەكەی دابنەیت , ئەم كارە بە (الاسقاط ) یش ناودەبرێت , زیاتر لە هەمزەدا ڕوودەدات , لابردن ئەوە دەگرێتەوە كە لە ڕەسمی نووسینەوەی موسحەفدا جێگیر بێت , بۆ نموونە لە قیرائەتی ئەوانەی بە پیتی (ي ) لە سەر وشەی (وكأين )آل عمران / 146 ڕادەوەستن , هەروەها لابردن ئەوەش دەگرێتەوە كە لە دەربڕیندا جێگیرە , ئەمەش زۆرجار ڕوودەدات , بۆ نموونە نەهێشتنی

درێژکردنەوەی میمی کۆ( میم الجمع ) لە کاتی ڕاوەستاندا لە لای ئەوانەی کە بە درێژکردنەوە ( صلة ) دەیخوێننەوە .

## 153-الحرف : پیت .

دەنگێکە پشت دەبەستێتە بڕگەیەکی جێبەجێکراو یان خەملێنراوە , کەبریتیە لەوەی قسەی پێ دەکرێت , ( أ - ب - ت - ث ... هتد ) بەناوبانگیش ئەوەیە ژمارەیان ( 29 ) پیتە , دەپیتیان زیادە یان پێ دەوترێت , نۆزدەشیان ڕەسەنن , سەبارەت بەو پیتانەی بە ( الزائدە ) ناسراون کۆکراونەتەوە لە وشەی ( سألتمونيها )

لە زمانی عەرەبیشدا هیچ پیتێکی زیادە دروست نابێت نە لە ناو و نەلە کرداردا جگە لەم دەپیتە , مەبەستیش لە زیادە لێرەدا ئەوەیە پیتێکی زیادە بێت لە سەرووی وەزنی ( فعل ) واتە : وەکو فائی فیعل بێت نەعەین و نەلام و وەکو ( إستكبر ) لە جێگەی تریشدا وەکو بنەما دێت , بۆیە بە ( الحروف المذبذبة ) دەناسرێن واتە : ناجێگیرەکان , بەلاّم سەبارەت بە ( الحروف الاصليه ) واتە : پیتە بنچینەییەکان بریتین لە نۆزدە پیت جگە لە پیتە زیادەکان , بۆیەش ئەو ناوەی لێ نراوە چونکە لە زمانی عەرەبیدا هەمیشە وەکو پیتی بنچینەیی دێت .

پێنج پیتی لاوەکیش هەیە جگەلەوبیست و نۆپیتە لە زمانی عەرەبیدا بەکاردێت و لە قورئانیشدا هاتوون , کەبریتین لە : نونی سوککراو و ئەلیفی لارکراو و ئەلیفی قەڵەو , وەکو چۆن لە ڕێگەی الازرق ك د لە دەوروبەری 240 ك ) لە ڕیوایەتی (ورش ك د 197 ك ) هاتووە , هەروەها قەڵەوکردنی لام و صادی تێکەڵکراو بە پیتی زای وەکو ئەوەی لە وشەی (الصراط ) دا هاتووە و هاوشێوەکانی لە قیرائەتی حەمزە , هەروەها هەمزەی ئاسانکراوی مام ناوەندی (بین بین ) پێشی دەوترێت : (الحروف المشربة ) و (الحروف المخالطة ) , چونکە لە گەڵ غەیری خۆیدا تێکەڵ بووە .

*قیرائەت , واتە : قیرائەتی هەموو پێشەوایەك بە حەرف دەناسرێت , وەکو وتوویانە : حەرفی نافیع و بە حەرفی ئیبنو مەسعود و فلا ن و فلاَن خوێندوویەتی واتە : قیرائەتی ئەوان , بەهەمان شێوە قیرائەتی هەموو پێشەوایەك حەرفی پێ دەوترێت .

154-الحركة:جووڵە , بزوێن .

نیوەی ئەلیف , بەم بزوێنەش لە لای زانا دواییینەکان بڕی درێژکردنەکەیان دیاری دەکرێت کە بریتییە لە نیوەی درێژکردنەوەی

ئاسایی ( المد الطبيعي ) كاتەكەشی بە رێژەی بەرزكردنەوەو داگرتنی پە نجەیەك مەزەندە دەكرێت , بەشێوازێكی مام ناوەندی نەخێراو نەخاو , هەروەها بە ( فويق ) و ( فوق ) یش دەناسرێت واتە : بە رێژەی سێ جووڵە , فلأنە خوێنەر بە ( فويق التوسط ) یان ( فوق التوسط ) قورئانی خوێند , واتە : بە بڕی پێنج جووڵە

155- **الحركة العارضة**: بزوێنی تووشبوو .

بزوێنی یەكگرتنی دوو پیتی ڕاوەستاو ( ساكن ) وەكو : فەرموودەی خوای گەورە : ( لم يكن الذين ) البينة / 1 , هەروەها بزوێنی هەمزەی گواستراوە بۆڕاوەستاوی پێش خۆی , وەكو فەرموودەی خوای گەورە : ( وا نحر , إن ) الكوثر / 2,3 , بە پێی ڕیوایەتی ( ورش ك د 197 ك ) چونكە كۆتایەكانی ئەم وشانەوهاوشێوەكانی ڕاوەستاون , بەلأم لە بەر یەكگرتنی دوو پیتی ڕاوەستاو ( التقاء الساكنين ) یان گواستنەوە ( النقل ) بزوێنی پێ دەدرێت , هەردووكیشیان تووش هاتوون لە پێگەیاندندا , نامێنن لە ڕاوەستاندا .

156- **الحركة المختلسة**: بڕوانە الاختلاس .

157-حرم : مەکـکە :

ئەم زاراوەیە لە کتێبی (طیبة النشر فی القراءات العشر ) ئاماژەیە بۆ (ابن كثير المكيك د 120 ك ) و (ابو جعفر المدني) ( ك د 130 ك نافع المدنی ك د 169 ك )

158- الحرمي :بڕوانە : الحرميان .

159- الحرميان :دانیشتووی هەردوو حەرەمی مەککەو مەدینە .

لە حەوت پێشەواکانی قیرائات (ابن كثير ) و (نافع المدني ) دەگرێتەوە مەبەستیش لە هەردوو حەرەم حەرەمی مەککەو مەدینەیە , پێشیان دەوترێت : ( حرمی ) .

160-الحروف الأصلية :بڕوانە : الحرف .

161- الحروف الزائدة:بڕوانە : الحرف .

162- الحروف الفرعية :بڕوانە : الحرف .

163- الحروف المخالطة:بڕوانە : الحرف .

164- **الحروف المذبذبة** :بڕوانه : الحرف .

165- **الحروف المشربة** :بڕوانه : الحرف .

166- **الحروف المشوبة** :بڕوانه : الحرف .

167- **حصن** :قەلا , پەناگە .

لە کتێبی (الشاطبیة ) لەحەوت قیرائەتە کە مەبەست لەم زاراوەیە (عاصم بن أبی النجود ك د 127 ك ) و , (حمزه الزیات ك د 156 ك ) و (الکسائيك د 189 ك ) و , (نافع المدنيك د 169 ك ) ه .

168- **حـــق** :ڕاستی :

لە کتێبی (الشاطبیة فی القراءات السبع ) ئاماژەیە بۆ (ابن کثیر المکي ) و (أبو عمروالبصری ك د 154 ك ) , لە کتێبی (طیبة النشر في القراءات العشر ) یش , ئاماژەیە بۆ ئەو دوو پێشەوایە لە گەڵ (یعقوب الحضرميك د 205 ) .

169- **حما** :

لە کتێبی ( طيبة النشر في القراءات العشر ) ئاماژەیە بۆ (أبي عمرو البصريك د 154 ك ) و , (يعقوب الحضرميك د 205 ك ) .

## پیتی ( خ )

170- **الخط:** بڕوانە رسم المصحف .

171 - **الخلاف الجائز :** جیاوازیی بوارپێدراو .

ئەم زاراوەیە بریتییە لەوەی لە پێشەوانی قیرائاتەوە وەرگیراوە لە ڕووی سەرپشك کردنەوە , واتە : خوێنەر لە کاتی وەرگرتنی زانستەکەدا بەهەر شێوازێکیان بخوێنێ بواری پێدراوە , مەرجیش نیە بە هەموو شێوازەکان بخوێنیتەوە , بۆ نمونە : شێوازەکانی درێژکردنەوەی تووشهاتوو لە بەر ڕاوەستان (المد العارض للسكون ) .

172- **الخلاف المرتب:** جیاوازی ڕێك و پێك .

واتە : جیاوازییەکە لە وشەیەکی قورئانی پیرۆزدا لە پێشەوایەکەوە هاتبێت و شێوازێکی بدرێتە پاڵ هەندێ لە گێڕەوەرەکان , کەسانی تریشلە گێڕەوەرەکان شێوازی پێچەوانەیان لەو پێشەوایە گێڕابێتەوە ,

بۆ نموونە لە كتێبێكدا هاتبێت كە پێشەوا ( عاصم بی أبی النجود ك د 127 ك ) . لە ڕیوایەتی ( شعبە ك د 193 ك ) بە دەرخستن ( إظهار ) خوێندوویەتی , ئەوە دەگەیەنێت ( حفص ك د 180 ك ) كە گێڕەوەرەكەی تری ( عاصم ) ە بە تێهەڵكێشان ( إدغام ) خوێندوویەتی .

## 173- الخلاف المطلق: جیاوازی ڕەها :

واتە جیاوازی لە خوێندنەوەی وشەیەكی قورئان بدرێتە پاڵ یەكێك لە پێشەوایانی قیرائات , هەریەكێك لە گێڕەرەوەكانی زیاتر لە شێوازێك خوێندنی هەبێت , بۆ نموونە : پێشەوا ( عاصم ) ( ك د 127 ك ) بە دەرخستن و تێهەڵكێشان خوێندوویەتی كەواتە هەریەكێك لە( شعبة ) و ( حمض ) ئەو دوو حوكمەیان هەیە .

## 174- الخلاف المفرع :

واتە : جیاوازی لە وشەیەكی قورئانی پیرۆز هەبێت لەم ( رواية ) یان لە ( طريق ) , بەڵام ڕیوایەت و ڕێگاكانی تر تەنها یەك شێواز خوێدنیان هەبێت , بۆ نموونە ئەگەر لە كتێبێكدا هات كە پێشەوا ( عاصم ) لە ڕیوایەت ( حفص ) دا ( اضهار ) ی هەیە , هەروەها ئەو ڕووەكەی تریشی

هەیە وەکو لقێك لێی وەرگیراوە , بەلاَم (شعبە ) کە گێڕەوەرەکەی تـرە تەنها (إدغام ) ی هەیە.

175- **الخلاف الواجب :**جیاوازی پێویست .

پێچەوانەی دەق و ریوایەت . کەنابێت کەمتەرخەمی تێدابکرێت لە کاتی دانیشتنی قوتابی لە بەر دەستی مامۆستای قیرائاتدا , ئەم جۆرە جیاوازییە لە قیرائەت و ریوایەت و ڕێگەیشدا دروست دەبێت , زۆربەی جیاوازیەکانیش کە لە پێشەوایانەوە هاتووە لەم جۆرەیە .

176- **الخلط:**بڕوانە : ترکیب القراءات .

177-**خیالالبنر :**بڕوانە : خیال الهمزة .

178-**خیال الهمزه :** ئەندێشەی هەمزە .

جۆرێکە لە جۆرەکانی سووکردنەوەی هەمزە , لە نیوان بەتەواودەربڕینی هەمزەو ئاسانکردنەوەی بە شێوەیەکی مام ناوەندی لە ڕێگەی گێڕەوەکانی پێشەوا (أبو جعفر المدنيك د 130 ك ) ناسراوە بەچەند

شێوازێکی نامۆ کە ئەمڕۆ ئیشیان پێ ناکرێت لە لایەن شارەزایانی قیرائات و دەشناسرێت بە ( خيال النبر ) .

## پیتی ( ذ )

179- ذوات الراء :ئەو وشانەی کە پیتی کۆتاییان ئەلیفەو پێش ئەوەش پیتی ( ر ) یە , وەکو ( بشرى ) .

180- ذواتالواو :مەبەست لە پیتەکانی ئەلیفە کە لە پیتی (و ) هەڵگەڕاوەتەوە , لە ناوەکاندا بە ( مثنى ) کردن دەناسرێتەوە و لە کردارەکاندا بەوە دەتوانین بیناسینەوە کە کردارەکە بە پاڵی خۆت بدەیت , بۆ نموونە : صفا : صفوت , دعا : دعوت , ئەمەو هاوشێوەکانی لارکردنەوە ( إمالة ) یان تێدا نیە .

181-ذوات الياء :ئەو ئەلیفانەی لە کۆتایی وشەدا دێن لە پیتی ( ى ) هەڵگەڕاونەتەوە , لە ناوەکاندا بە دووکردن ( تثنية ) دەناسرێتەوە , لە کردارەکانیشدا بەوە دەتوانرێت بناسرێتەوە کە کردارەکە بە پاڵی خۆت بدەیت , نموونەکان : مولى : موليان , رمى : رميت , ئەمانەو

هاوشێوەكانیان لاردەكرێنەوە . هەروەها ئەو وشانەی كۆتایەكانیان پیتی ئەلیفە كە لە پیتی ( ي ) هەڵگەڕاونەتەوە لەگەڵ هاوشێوەكانی كە لاركردنەوە ( إمالة ) دەیانگرێتەوە , وەكو : ( النصارى ) ( البشرى ) .

## پیتی ( ر )

**182-رؤوس الآي:** سەری ئایەتەكان .

سەری ئایەت واتە : كۆتا وشەی ئایەتەكە و هەروەها پێشی دەوترێت : ( آخر الاية ) واتە : كۆتایی ئایەت , یان ( فاصلة ) واتە : نێوان دوو شت , كۆیش دەكرێنەوە بە ( رؤوس الآي ) و ( أواخر الآي ) و ( الفواصل ) .

**183-الروم :** دەربڕینی هەندێ لە بزوێن لە كاتی ڕاوەستاندا .

*دەربڕینی هەندێ لە بزوێنی پیتەكە لە كاتی ڕاوەستاندا , ئەمەش تایبەتە بە حاڵەتەكانی ( رفع ) و ( ضم ) و ( جر ) و ( كسر ) نەك ( فتح ) و ( نصب ) , بەشی لابراویش لە بزوێنی پیتەكە بە دوو لە سەر سێ و دەربڕدراویش بەسێ یەك مەزەندە دەكرێت , زانایانی كووفە بە ( اشمام ) ناویان بردووە.

*لەلایەن کۆمەڵانێك لە زانایانی قیرائاتیش بەتێکەڵکردنی بزوێنێك بە بزوێنێکی تر دەناسرێت , وەکو : قیل لە قیرائەتی ئەو پێشەوایانەی ئیشمامیان هەیە , بە شێوازێك کە ژێری یەکەم پیتی وشەکە بەلای بۆردا دەبات وەکو ئاماژەیەك بۆ بنچینەکەی , هۆی ناونانیشی بە ( روم ) لەبەر ئەوەیە تۆ سەرەتا دەتەوێت بە ( ضمة ) بیخوێنیتەوە بەڵام دەگوێزرێتەوە بۆ کەسرەو پیتی ( ي ).

184-**رسم المصحف:** ڕێنووسی موسحەف ( قرآن ) .

خەتی پێنج موسحەفە عوسمانیەکان کە خەلیفەی مەزن عوسمانی کوڕی عەففان ڕەزای خوای لێبێت ( ك د 35 ك ) فەرمانی بە نووسینەوەو ناردنی بۆ ناوچە جیاجیاکان کرد , کە جێگای یەکدەنگی زانایانە , ئەم شێوازی نووسینەوەش دەبێتە دوو بەشەوە .

( قیاسی ) و ( اصطلاحی ) واتە : پێوانەی وزاراوەیی , جا پێوانەی ئەوەیە کە خەتەکەو دەربڕینەکە وەکو یەك بن , زاراوەکەش کە جیاوازییەکیان هەیە ئیتر چی زیادە بێت یان لابردن یان لە جیاتی یان پێکگەیاندن یان لێکترازان .

ئێنجا ڕێکەوتنی خوێندنەوە لە گەڵ شێوازی نووسینەوە یەکێکە لە مەرجەکانی شێوازی خوێندنەوەی پەسەند لە قیرائاتدا , مەبەستیش لە ( موافقه الرسم ) ئەوەیە کە قیرائەتەکە ڕێکەویێت لە گەڵ یەکێك لەو موسحەفە بەناوبانگانەی پێشەوا عوسمان ڕەزای خوای لێبێت کە ناردنی بۆ ناوچەکان , ئیتر ئایا ئەو ڕێکەوتنە بەتەواوی و بەڕاشکاوی بێت , یان بە مەزەندەو ئەگەربێت , چونکە بە کۆدەنگی زانایان هەندێ لە ڕێنووسی ئەو موسحەفانە پێچەوانەیان ئەنجام دراوە , وەکو ( الصلوة ) و ( الزكوة ) بەم شێوەش هەندێك لە قیرائاتمان پێگەیشتووە وەکو قیرائەتی ( ملك ) لە سورەتی ( الفاتحة ) بە جێگیرکردنی پیتی ئەلیف , ئەمە لە کاتێکدا کە ئەو وشەیە بەبێ ئەلیف نووسراوە , بۆیە لەوانەیە مەبەست ئەوە بێت وەکو چۆن لە پیتی ( الرحمن 9 و ( اسحق ) لابراوە ئەویش بەهەمان شێوە .

185-**الرسميات:**بڕوانە : الرمز .

186-**رضى :**ڕازییوون .

ئەم زاراوەیە لە کتێبی ( طيبة النشر في القراءات العشر ) ئاماژەیە بۆ ( حمزه الزيات ) ( ك د 156 ك ) و , ( الكسائي ) یە ( ك د 189 ك )

187-**الرفع**:بزوێنی بۆر.

*بزوێنی بۆر ( حركة الضم )

*درێژکردنەوەی پیتی (م ) ی کۆو گەیاندنی بە پیتێکی واو لە دەربڕیندا .

188-**الرمز**: هێما

ئەو پیت و وشانەیە کە وەکو هێما ئاماژەی پیٚ دەکرێت بۆ پێشەوایەك یان چەند پێشەوایەك ئیتر چی لە پێشەوایانی قیرائات یان گێرەرەوەکانیان بن ,لە دانەرێك بۆ دانەرێکی تریش جیاوازی تێدا هەیە لەلای (المغاربة ) ڕۆژئاواییەکان بە (الرمزيات ) دەناسرێت کەمەبەستیان پێی ئەو هێمایانەیە کە تایبەتە بە زانستی ڕەسمی قورئان و هێماکانی وشەکانی , ئەم هێمایانەش دەخرێتە سەر ئەو وشانەی کە جیاوازی هەیە لە خوێندنەوەیدا , بەلاٚم دواتر نووسینی تایبەت دەربارەی ئەنجامدرا , جا ئەوەی کە پەیوەندی بە قیرائاتەوە هەبوو ناونرا(الرمزيات ) و ئەوەش پەیوەندی بە ڕێنووسی موسحەفەوە هەبوو ناویان نا (الرسميات ).

189-**الرمزيات**: بڕوانە : الرمز .

190-**الرموز**:بڕوانە : الرمز .

191-**الروادف** :هێماکان .

ئەم زاراوەیە بریتییە لەئەو هێمایانەی بەکاردێن بۆ ئاماژەکردن بۆ دوو پێشەوای قیرائات و بەرەو سەرەوە کە بریتین لەشەش پیت کۆکراونەتەوە لە ( ثخذ طغش ) .

192-**الرواية** :گێڕانەوە .

مەبەست لەم زاراوەیە جیاوازی گێڕەرەوەکانە لە یەکێك لە حەوت پێشەوایانی قیرائات یاندە پێشەواکەیان هەر پێشەوایەکی تر لە ئاستی ئەواندا بێت لە زانستی قیرائاتدا .

193 **رواية الحروف** : بڕوانە قراءة الحروف

194-**روى** :گێڕایەوە .

هێمایەکە بۆ پێشەوا ( الكسائي ك د 189 ك ) و بۆ ( خلف البزار ك د 229ك ) لە کتێبی ( طيبة النشر في القراءات العشر ) بەکارهاتووە .

## پیتی ( س )

**195-السكت :** بێ دەنگی .

*بڕینی دەنگ بۆ ماوەیەك کەمتر لە کاتی ڕاوەستاندن بەبێ هەناسەدان , هەروەها پێشی دەوترێت ( سكتة خفيفة ) و ( سكتة قصيرة ) و ( وقفة يسيرة ) و ( وقفة خفيفة ) و ( وقَيفة )

*لەلای زانا دێرینەکان بە ( وقف ) واتە : ڕاوەستان دەناسرێت .

**196-سكتة خفيفة :** بڕوانە : السكت .

**197-سكتة قصيرة :** بڕوانە السكت .

**198-سكتة لطيفة :** بڕوانە السكت .

**199-سكتة مختلسة :** بڕوانه السكت .

**200- سكتة يسيرة :** بڕوانه : السكت .

**201-سما :**بەرزبوویەوە .

ئەم زاراوەیە لە كتێبی ( الشاطبية في القراءات السبع ) ئاماژەی پێكراوە بۆ پێشەوایان ( ابن كثير المكي ) ( ك د 120 ك ) و ( ابو عمرو البصري ) ( ك د 154 ك ) ( نافع المدني ك د 169 ك ) هەروەها لە كتێبی ( طيبة النشر في القراءات العشر ) ئاماژەی پێ دەكرێت بۆ ئەوانەی باسكران و ( ابو جعفر المدني ك د 130 ك ) ( يعقوب الحضرمي ك د 205 ك )

**202- السماع :**گوێگرتن .

یەكێكە لە جۆرەكانی زانست وەرگرتن لە مامۆستایان , كەبریتییە لە گوێگرتن لە قسەكردنی مامۆستا , زانایان ئەم شێوازەیان بە تەنها پێ جائیز نییە بۆ فێربوون و وەرگرتنی قورئان , چونكە هەموو كەسێك

توانای ئەوەی نیە چۆن لە مامۆستاکەی وەریگرتووە بەو شێوەیە بیخوێنێتەوە و بیگەیەنێت , بۆیە بەمەرجیان داناوە قوتابی قورئان بۆ مامۆستاکەی بخوێنێتەوە .

203-**سماع الحروف:** بڕوانە : قراءة الحروف .

204-**سماوي :**خەڵکی سەماوە .

مەبەست لەم زاراوەیە ئاماژەکردنە بۆ زانایانی کووفەو (أبن عامر الشامی ك د 118ك ) وشەی (سما ) ئاماژەیە بۆ ناوچەی سەماوە لە نیوان کووفەو شامدا .

205-**السُّنة:**بڕوانە : القراءة سنة .

206- **السُّنة :**بڕوانە الاسانید .

207-**السَواد :**ڕەشی .

مەبەست لەم راراوەیە شێوازی نووسینەوەی موسحەفە , چونکە موسحەفەکان بە مەرەکەبی ڕەش دەنووسران .

# پیتی ( ش )

208  الشامی: خەڵكی شام .

زاراوەی ( الشامي ) ئامارژەیە بۆ پێشەوا ( ابن عامر الشامی ك د 118 ك ) هەروەها پێشی دەوترێت ( شامي ) .

209- شامي: بڕوانە : الشامي .

210-شبیه البدل: بڕوانە : مد البدل .

211-الشجرية : پیتەكانی ناوەڕاستی دەم .

ئەوپیتانە دەگرێتەوە كە لە ناوڕاستی دەمەوە دەردەچێت كە بریتین لە ( ش, ي , ج ) وشەی ( الشجر ) شوێنی كرانەوەی دەمە.

212-شفا: لێوار .

ئەم زاراوەیە لە کتێبی (النشر في القراءات العشر ) ئاماژەی بۆ پێشەوا (حمزة الزيات ك د 156 ك ) (الكسائى ك د 189 ك ) (خلف البزارك د 229 ك ) .

**213-شيخان :**دوو مامۆستاکە .

هەروەها بە (الشيخان ) یش ناودەبرێت , ئاماژەی پێ دەکرێت بۆ پێشەوا ( حمزه الزيات ) و (علي الكسائي) هەروەها ئاماژەی پێ دەکرێت بۆ (ابن كثير ) و (ابي عمرو ) پێکەوە , بە پێی ئەوەی نووسەران لە کتێبەکانیاندا ئاماژەیان پێ کردووە , بەلاّم زۆربەیان لە سەر یەکەم بۆچوونن .

## پیتی (ص)

**214-صحاب :** هاوەڵان .

له کتێبی( الشاطبیة في القراءات السبع ) ئاماژەی پێ دەکرێت بۆ پێشەوا ( حمزة الزیات ) و ( الكسائی ) و ( حفص )له ( عاصم بن ابیالنجود ) .

**215- صحب:** هاوەڵان : له ( طیبة النشر في القراءات العشر ) ئاماژەی پێ دەکرێت بو( حمزه الزیات والكسائی وخلف العاشر ) و( شعبه ) ی گێڕەرەوەی ( عاصمبنأبی النجود ) هەروەها له ( طیبة النشر في القراءات العشر ) ئاماژەی پێ دەکرێت بۆ ئەوانە لەگەڵ ( خلف البزار ) دا.

**216-صحبة :** هاوڕێتی .

له کتێبی ( الشاطبیة في القراءات السبع ) ئاماژەی پێ دەکرێت بۆ پێشەوایان ( حمزه الزیات ) و ( الكسائي ) و ( شعبة ) له ( عاصم بن أبی النجود ) , هەروەها له کتێبی ( طیبة النشر في القراءات ) ئاماژەی پێ دەکرێت بۆ ئەو پێشەوایانە لە گەڵ ( خلف البزار ) یش .

**217-الصریحان :** دوو پێشەوا بە ڕەچەڵەك عەرەبەکان .

ئەم زاراوەیە ئاماژەی پێدەكرێت بۆ (ابو عمروالبصري ك د 154 ك ) و (ابن عامر الشامي ك د 118 ك ) شایانی باسكردنە ئەم زاراوەیە تەنها لە لایەن (ابن الجندي ) لە كتێبی (البستان ) بەكارهاتوو.

218- صفا :ڕوونبوویەوە .

لە كتێبی (طيبة النشر في القراءات العشر ) ئاماژەی پێ دەكرێت بۆ پێشەوا (خلف البزار ك د 229 ك ) هەروەها بۆ (شعبه ) لە (عاصم بن ابى النجود ك د 127 ك )

219- الصلة : پێكگەیاندن .

*دەربڕینی پیتی (ه) ی ڕاناو كە ئاماژەی پێدەكرێت بە تاكی ئامادەنەبووی پێكگەیەنراو بە درێژكردنەوەیەكی وشەیی بگونجێت لە گەڵ بزوێنەكەیدا , واتە : بۆرەكەی دەدرێتە دەم پیتی (و) و ژێرەكەشی دەدرێتە دەم پیتی (ي) .

*دەربڕینی پیتی (م) ی كۆو گەیاندنی بە پیتێكی درێژكراوی وشەیی گونجاو لە گەڵ بزوێنەكەیدا واتە : درێژكردنەوەی بزوێنی (ضمة ) لە گەڵ پیتی (و ) لەلای هەندێك لە زانایانیش (ضم الميم ) و (رفع الميم ) ناودەبرێت .

# پیتی ( ض )

220-**الضم :**بۆر

*بەبزوێنی بۆر دەوترێت .

*لەلای زۆرێك لە زانا دێرینەکان مەبەستیان لەم زاراوەیە تێکەڵکردنی بزوێنێکە بە بزوێنێکی تر , وەکو ( قیل ) لە قیرائەتی ئەو پێشەوایانەی ( إشمام ) یان هەیە , بە شێوازێك بزوێنی ژێر ( کسره ) ببرێت بۆ لای بۆر ( ضمة ) وەکو ئاماژەیەك بۆ بنچینەکەی هۆکاری ناونیشانی بەو زاراوەیە لەبەر ئەو ( إشمام ) ەی لە ( ضمة ) دروست بووە , وەکو چۆن لە پیتی لارکراو بە ( إماله ) ناویان بردووە .

221-**ضم میم الجمع :**بڕوانە : الصلة .

# پیتی ( ط )

**222-طرح الهمزة :لابردنی هەمزە .**

**واتای ئەم زاراوەیە بریتییە لە لابردنی هەمزە بیٚ ئەوەی بە هیچ قەرەبوو بکریٚتەوە .**

**223-الطرق :بڕوانە : الطریق .**

**224- الطریق:ڕیٚگە .**

**بریتییە لەوەی کە هەواڵ بەرەکان ناکۆکیان لە سەری هەیە لە یەکیٚك لە گیٚڕەوەرەکانی حەوت پیٚشەواکان یا ندە پیٚشەواکانی قیرائات و خاوەن هەڵبژاردنەکان , کۆی ( الطریق ) ( طرق ) ە .**

**225- الطول:مەددی دریٚژ .**

**دریٚژترین پایەکانی مەدد کە پیٚشەوایانی قیرائات کاریان پیٚکردووە , هەروەها پیٚیدەوتریٚت : ( الطولي ) و بە دریٚژی سیٚ پیتی ئەلیف مەزەندە دەکریٚت .**

**226-الطولي :بڕوانە : الطول .**

# پیتی ( ع )

227-العامة :گشتی

*جمهوری پێشەوایانی قیرائات .

*پێشەوایانی قیرائاتی مەدینەو كووفە .

*پێشەوایانی هەردوو حەرەمی مەككەو مەدینە.

228-عراقي:بڕوانە : اهل العراق .

229- العراقيون :بڕوانە : اهل العراق .

230-العربيان :دوو پێشەوا عەرەبەكە .

مەبەست لەم زاراوەیە ( ابن عامر الشامی ك د 118 ك ) و ( الكسائی ك د 189 ك ) ە .

231-العرض:قورئان خوێندنی قوتابی لە بەردەستی مامۆستاكەی زاراوەی ( العرض ) بریتییە لە یەكێك لە جۆرەكانی وەرگرتنی زانست لە مامۆستایانەوە .

232-العرضة الأخيرة:کۆتا خستنە ڕوو .

واتای ئەم زاراوەیە بریتیە لەوەی کە پێغەمبەر (صلى الله علیەو سلم ) بێت خوێندیەوە لە قورئانی پیرۆز لە ساڵی لە ساڵی لە دونیا دەرچووندا بۆ جیبریل سەلامی خوای لیٚ بیٚت .

233-عصر الضاد : گوشینی پیتی (ض)

واتە : دەربڕینی لە نیوان (ص) و (ز ) کە لەلای زۆرینەی زانایان بە (إشمام ) ناودەبریٚت .

234-علل القراءات:بڕوانە : توجیە القراءات .

235- علوي :بڕوانە : أهل العالیة .

236- عم :

لە کتیٚبی (الشاطبیة في القراءات السبع ) ئاماژەی پیٚ دەکریٚت بۆ پیٚشەوا (ابن عامر الشامي ) و (نافع المدني ) هەروەها لە کتیٚبی (طیبة النشر في القراءات العشر ) ئاماژەی پیٚدەکریٚت بۆ ئەو دو پیٚشەوایە و بۆ (ابو جعفر المدنی ) .

237-عن نفسە:بڕوانە : الاختیار .

# پیتی ( ف )

238- **الفاصل :**نێوان .

( الحاجز ) واتە : پەرژینیشی پیٚ دەوترێت , مەبەست لەم زاراوەیە ئەو ڕاوەستاو ( ساكن ) ە یە كە دەكەوێتە نێوان حوكمی پیت و هۆكارەكەی , جا هەندێك لەوانە كاریگەری هەیە كە پێی دەوترێت ( حاجز حصين ) واتە : پەرژینی قایم , وەكو : پیتەكانی بەرزیی ( الاستعلاء ) كاتێك ( ساكن ) بن و بكەونە نێوان پیتی ( ر ) و بزوێنی ژێر ( كسرة ) لە ڕیوایەتی ( ورش ك د ك 197 ) لە ڕێگەی ( الازرق ) ك د لەدەوروبەری 240 ك ) لەم حاڵەتە ناسك ( ترقيق ) ناكرێت جگە لە پیتی ( خ ) نەبێت جگەلەوەش بە ( حصين ) دانانرێت چونكە ڕێگرنیە لە ناسككردنەوە .

239- **الفاصلة :** بڕوانە : رؤوس الآي .

240- **الفتح :** سەر .

دەربڕینی پیت بەتەواوی بە شێوازێك كە خوێنەر دەمی بکاتەوە بۆ دەربڕینی ئەو پیتە , ئەگەر لە پاش پیتی ئەلیفیشەوە بێت زیاتر دەر دەکەوێت , واتاکەی . دەرچوونی پیتی ئەلیف لە جێگای خۆیەوە بە بێ ئەوەی لە گەڵ دەنگی ( ی ) یان ( و ) تێکەڵ بکرێت , هەربۆیە دەربڕینی لێ دەکرێت بە ( اخلاص الفتح ) واتە : فەتحەی پەتی , چۆنیەتیەکە ی : دەربڕینی پیتی ئەلیف بە فەتحەیەکی تەواوی لارنەکراوە بۆ لای کەسرە , دیاریکردنی : بە شێوازێك بوترێت بە ئەندازەی کرانەوەی دەم , بۆ نموونە وشەی ( کان ) دەنگی ئەلیفەکە دەخرێتە سەر فەتحەی پیتی ( ك ) بە هیچ شێوەیەکیش تێکەڵی کەسرەنابێت زانا دێرینەکان بەم فەتحە  کە دژی لار کردنەوەیە  وتوویانە ( تفخيم ) و ( نصب ) و ( الفتح المتوسط ) و ( الترقيق ) .

241- **الفتح الشديد** :زیاد کردنەوەی دەم .

مەبەست لەم زاراوەیە ئەوەیە کەسەکە زیادەڕەوی بکات لە کردنەوەی دەمی لە کاتی دەربڕینی ئەو پیتە , ئەمەش لە قورئاندا جائیز نییە , بەڵکو لە زمانی عەرەبیشدا بوونی نییە , بەڵام لە لای عەجەمەکان ئە نجام دەدرێت , لە زانستی قیرائاتیشدا  وەکو زانایان فەرموویانە 

قەدەغەیە , هەر ئەوەشە كە پێی دەوترێت(التفخيم المحض ) واتە : قەڵەوكردنی تەواو .

**242-الفتح المتوسط :** بڕوانە : الفتح .

**243-فتـــى :** لاو .

لە كتێبی (النشر في القراءات العشر ) ئاماژەی پێدەكرێت بۆ (حمزة الزيات , ك د 158 ك ) و , (خلف البزارك د 229 ك ) .

**244-الفرش :** ڕاخراو .

بریتییە لەو حاڵەتانەی لە زانستی قیرائاتدا دەربارەی چەند مەسەلەیەكی دیاریكراو هاتوون و هەموو جارێك یەك حوكمی نیە , كەواتە بریتییە لەو پیتانەی كە زانایانی قیرائات ناكۆكیان لەسەری هەیە بەڵام ڕۆڵی كەمە , بۆیەش ناونراوە (فرش ) چونكە لە قورئاندا بڵاوە , وەكو ئەوەی ڕاخرابێت , هەندێ لە زانایانیش بە (الفروع ) ناویان بردووە لە بەرامبەر (ألاصول ) دا , هەروەها پێی دەوترێت , (فرش الحروف ) لە لای زۆرینەی زانایان , یان (فرش السور ) لە لای هەندێكی تر .

245- الفروع:بڕوانه : الفرش .

246-الفصل :لێکترازان .

*بواری پیتی ئەلیف له نیوان دوو پیتی هەمزه به یەکتر گەیشتبێتن له لای ئەو پێشەوایانەی جیاوازیان له نیواندا دەکەن , ئەمەش به (الادخال ) زیاتر بەناو بانگه و پێشی دەوترێت (المد الفاصل ) .

*مەبەست له (بسم اللهالرحمن الرحيم )ه له نیوان دوو سورەتدا .

247-الفـخـر :بڕوانه : الفتح

248-الفواصل :بڕوانه : رؤوس الأي .

249-فوق التوسط :بڕوانه : الحركة .

250- فوق القصر :بڕوانه : الحركة

251-فويقالتوسط :بڕوانه : الحركة

252-فويق القصر :بڕوانه : الحركة .

253-في أختياره:بڕوانه الاختيار .

# پیتی ( ق )

254- **القارىء :** خوێنەر

ئەم زاراوەیە ئەو کەسە دەگرێتەوە کە هەموو قورئانی لەبەربێت و بەو شێوەش قورئانی بە قیرائات تەواوکردبێت و کۆیکردبێتەوە .

255- **القارىءالمبتديء :** خوێنەری سەرەتایی .

ئەو کەسەیە کە دەستی کردبێتە خوێندنی قیرائات و سێ قیرائاتی بە جیا تەواو کردبێت .

256- **القارىء المنتهي :**

ئەو کەسەیە کە زۆربەی قیرائات و بەناوبانگترینیانی تەواو کردبێت لە بەر دەستی مامۆستاکەیدا بە شێوازی ( المشافهة ) لە دەمی وەریگرتبێت .

257- **القاعدة :** بڕوانە : الاصول .

**258-القبائل الثلاثة :** سیٚ هۆزەكە .

دوو هەمزەی وەكو یەك لە دوو وشەدا : ئیتر ئایا هەردوو كیان سەر یان ژیٚریان بۆریان هەبیٚ , وەكو فەرموودەی خوای گەورە ( هولاء إن ) ( اولیاء أولئك ) ( شاء أنشره )

**259-القرا ء السبعة :** بڕوانە القراءات السبع .

**260-القراإلعشرة :** بڕوانە : القراءات العشر .

**261- القراءات :** قیرائات

ڕیٚڕەوی زانایانی قیرائات و گەیاندنی ئەو زانستە سەبارەت بە چۆنیٚتی وشەكانی قورئانی پیرۆز لە ڕووی سووككردن و شەددەداركردن و شتی تر .

**262- القراءات الآحاد :** بڕوانە القراءاتالأربع .

**263-القراءاتألاحدى عشر :** یانزە قیرائاتەكە .

ئەم زاراوەیە دە قیرائاتە ( متواتر ) ەكان و قیرائەتی نامۆی ( سلیمان بن مهران الاعمش الكوفى ك د 148 ك ) دەگریٚتەوە .

**264-القراءات الاربع : چوار قیرائاتەکە .**

**بە ئەو چوار قیرائەتە دەوترێت کەلەم چوار پێشەوایانە وە دەگێڕدرێتەوە : (الحسن البصری ك د 110 ك ) ( ابن محیصن ك د 123 ك ) , الأعمش الكوفي ك د 148 ك ) , ( یحی الیزیدي ك د 202ك ) کە بریتییە لە یەکێك لە قیرائەتە نامۆکان , بەناوبانگترین قیرائاتیشە لە پاش دە قیرائاتەکە .**

**265- القراءات الأربع عشر : چواردە قیرائاتەکە**

**ئەوقیرائاتانەیەکە دەدرێنە پاڵ دە پێشەوا بەناوبانگەکان لە گەڵ ئەم چوار پێشەوایەش (الحسن البصري ك د 110 ك ) (إبن محیصن المكي ك د 123ك ) (الاعمش الكوفي ك د 148 ك ) ( یحیی الیزیدي البصري كد 202ك ) 0**

**266- القراءات الباطلة : بڕوانە : القراءاتالشاذة .**

**267- القراءات الثلاث :سێ قیرائاتەکان .**

**بە دوو جۆر لە قیرائات دەوترێت .**

*سێ قیرائاتە (متواتر )ە کان لە سەرووی حەوت قیرائاتەکان کە بریتین لە ( قیرائەتی ( ابو جعفر المدنی ك د 130 ك ) و (يعقوب الحضرمي ك د 205 ك ) و (خلف البزار ك د 229 ك ) ئەم بۆ چوونەش زیاتر ربە ناو بانگە .

*سێ قیرائاتی سەرووی دە قیرائاتە بەناوبانگەکان کە بریتین لە قیرائەتی (الحسن البصري ك د 110 )و( ابن محيصن المكي ك د 123 ك ) و (الاعمش الكوفي ك د 148 ك ) .

**268- القرا ءات الثمان :** هەشت قیرائاتەکان .

بریتین لە حەوت قیرائاتەکان و قیرائەتی (يعقوب الحضرمي ك د 205 ك ) کە ئەویش یەکێکە لە قیرائەتە ( متواتر ) ەکان .

**269-القراءات الخمسين :** پە نجا قیرائاتەکان .

ئەو قیرائاتانەیە کە زانا (ابو القاسم الهذلي ك د 265 ك ) لە کتێبی (الكامل فى القراءات الخمسين ) باسی کردوون , کە لە چل و نۆ کەسەوە لە پێشەوایانی حیجازو شام و عێراق دەیگێڕیتەوە جگە لە هەڵبژاردنەکانی خۆیشی .

**270- القراءات السبع :حەوت قیرائاتەکان .**

**ئەو قیرائاتانە دەگرێتەوە کە دەدرێنە پاڵ حەوت پێشەوا بەناوبانگەکان : ( أبن عامر الشامی ك د 168 ك ) , ( أبن كثير المكی ك د 120 ك ) , ( عاصم بن أبي النجود ك د 127 ك ) , ( ابو عمرو البصري ك د 154 ك ) ( حمزة الزيات ك د 156 ك ) ( نافع المدني ك د 169 ك ) ( الكسائي الكوفي ك د 189 ك ) قیرائاتی ئەم پێشەوایانە ( متواتر ) ن و نەوەکانی موسوڵمانان دەست بە دەست تاکو ئەم ڕۆژگارەی خۆمان ڕیوایەتی دەکەن و قورئانی پێ دەخوێننەوە , هەریەکە لە و قیرائاتانە ش بریتی نییە لەو حەوت شێوازەی لە فەرمووودەکاندا باسکراون , بەڵکو هەندێکیانی تێدایە یان یەك شێوازیان بە پێی ئەو جیاوازییەی لە نێوان زانایاندا هەیە لەو بارەوە .**

**271-القراءات الشاذة :قیرائەتە نامۆکان .**

**ئەم زاراوەیە ئەو قیرائاتانە دەگرێتەوە کە بەدەرن لە بنەمای قیرائاتە ( متواتر ) ەکان .**

لە ڕاستیدا زاراوەی (الشذوذ) واتە : نامۆیی لە لای پێشەوایانی قیرائات زاراوەیەکی تایبەتە , مەبەست پێی ئەو شێوازانەیە لە قیرائات کە بنەماکانی قیرائەتی (متواتر ) یان تێدا بە تەواوی دروست نەبووە , هەربۆیە ئەم جۆرە قیرائانەی خوارەوە بە نامۆ (شاذ) دادەنرێت : (القراءات الضعیفة ) واتە : قیرائەتە لاوازەکان و (القراءات الموضوعة ) واتە : قیرائاتە دروستکراوەکان و (القراءات المدرجة ) و (القراءات المذکرة  القراءات الغریبة )

واتە : قیرائاتەنامۆکان , هەموو ئەم جۆرە قیرائاتانە بە (شاذ ) دادەنرێن , بە هەمان شێوە (قراءات الآحاد ) واتە : ئەو قیرائاتانەی لە ڕێگەی یەك گێڕەرەوە پێمان گەیشتووە , بە واتایەکی تر هەموو قیرائاتێك جگە لە (القراءات العشر )

هەمووی بە نامۆ و (شاذ ) دەژمێردرێت .

**272- القراءات الصحیحة :** بڕوانە : القراءات المتواترة .

**273-القراءات الضعیفة :** بڕوانە : القراءات الشاذة .

**274- القراءات العشر :** واتە : دە قیرائاتەکان .

ئەم زاراوەیە بریتیە لەو حەوت قیرائاتەی دەدرێنە پاڵ حەوت پێشەوا بە ناوبانگەکان و هەروەها قیرائاتی سێ پێشەواکانی تریش لەە هەموویان بریتین لە ( ابن عامر الدمشقی , ابن كثير المكي , عاصم بن أبی النجود , ابو عمرو البصري , حمزة الزيات , نافع المدني , الكسائی ) ئەو سێ پێشەوایانە ش کەتەواوکەری حەوتەکەن بریتین لە : ( ابو جعفر المدني , يعقوب الحضرمي , خلف البزار ) ئەم دە قیرائاتانەی قورئانی پیرۆز نەوەکانی ئیسلام دەست بە دەست گواستوویانەتەوە تاکو ئەم سەردەمەی خۆمان .

**275-القراءات العشر الصغرى:** دە قیرائاتە بچووکەکان .

ئەو قیرائاتە (متواتر ) انەی کە لە کتێبی (الشاطبية في القراءات السبع ) و الدرة فی القراءات الثلاث المكملة للقراءات العشر ) دەگرێتەوە کە لە بیست ڕێگەوە پێمان گەیشتوون , بۆیەش ئەو ناوەی لێنراوە لە بەر کەمی ڕێگاکانی بەبەراورد لە گەڵ (القراءات العشر الكبرى ) کە لە دەوری هەزار ڕێگەوە پێمان گەیشتوون .

**276- القراءات العشر الكبرى :** دە قیرائاتە گەورەکان

ئەم زاراوەیە ئەو قیرائاتانە دەگرێتەوە کە لە دوو توێی کتێبی ( طيبة النشر فى القرا ءت العشر ) دا هاتووە , لە نزیکەی هەزار ڕێگاوە پێمان گەیشتوون , بە هۆی زۆری ڕێگەکانیشەوە ئەم ناوەی لێ نراوە , بە بەراورد لە گەڵ دە قیرائاتە بچووکەکان .

277- القرا ءت الغريبة: بڕوانە : القراءات الشاذة .

278- القراءات المتروكة :بڕوانە : القراءات الشاذة.

279- القراءات المتواترة : قیرائاتە فرە ڕێگاکان .

ئەم زاراوە یە ئەو قیرائاتانە دەگرێتەوە کە بنەماکانی قیرائەتی ڕاست و دروستی تێدا کۆبوونەتەوە کە ئەوانەش بریتییە لە گونجان لە گەڵ ڕێزمانی عەرەبی ئەگەر لە یەك ڕویشەوە بێت , هەروەها گونجاو بێت لە گەڵ یەکێك لە موسحەفەکانی عوسمان ڕەزای خوای لێ بێت ئەگەر چی بە ئەگەریش بێت , هەروەها جێگیربوونیسەنەدەکەی , جومهوری زانایانیش لە م بارەوە ( تواتر ) یان بە مەرج زانیوە .

شایانی باسە کە ( القراءات المشهورة ) و (القراءات الصحيحة ) بە پاشکۆی (القرا ء ات المتواترە ) دادەنرێت , کە بریتیە لەوەی بە سەنەدی ڕاست و دروست هاتبێت لە ڕێگەی کەسانی دادگەر ( عدل ) و ( ضابط ) تاکو کۆتایی سەنەدەکەی , هیچ شێوازێکی خوێندنەوەی

قورئانیش بە پەسەند دانانرێت تاکو لە ڕێگەی زۆرەوە نەگوازرابێتەوە و پێشەوایانی زانستی قیرائات پەسەندیان نەکردبێت , وەکو برِی زیادەی ئەو مەددانەی لە سەرووی ئەو ئەندازە مەددە هاوبەشانەی کە هەیە لە نیوان پێشەوایاندا , بەلاّم ئەم جۆرە لە قیرائات دەبێتە پاشکۆی (متواتر) چونکە هیچ گومانێك نییە لە سەر ئەوەی کە قورئانە ئەو جۆرە قیرائاتانە ش کە مەرجەکانی (تواتر) ی تێدایە بەدیدەکرێت بریتین لە دە شێوازی خوێندنەوەو کاتی قورئان (القراءات العشر) کە تاکو ئەم سەردەمەی خۆیشمان کاری پێدەکرێت .

**280 القراءات المدرجة**: برِوانة : القراءات الشاذة .

**281 - القراءات المشهورة**: برِوانه : القراءات المتواترة .

**282- القراءات المنكرة** : برِوانه : القراءات الشاذة .

**283- القراءات الموضوعة** : برِوانه : القراءات الشاذة .

**284-قراءاتالنبى صلى الله عليه وسلم :**

ئەو قیرائاتانە دەگرێتەوە کە بە زنجیرەی ئیسناد لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەگێڕدرێتەوە لە سەر ڕێبازی فەرمووده ناسان ,ئەم واتایەش ئەوە ناگەیەنێت کە تەنها ئەم جۆرە قیرائاتە دەدرێتە پاڵی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم تەواو بێت بە پێچەوانەی

خوێندنەوەكانی تر , بەڵكو هەموو ئەو قیرائاتانەی بە ( متواتر ) دەناسرێت دەدرێنە پاڵ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم , بەلاَم شایانی باسە ئەوەی كە دەگێڕ درێتەوە لەم جۆرە قیرائاتە نابێت بخوێنرێتەوە ئەگەر پێچەوانەی قیرائاتی ( متواتر ) بوو , با لە ( صحيح البخاري ) ش بێت , چونكە ئەوەی مەرجەكانی ( متواتر ) ی تێدا نەبێت ئەوە بە ( منسوخ ) یان ( شاذ ) دادەنرێت , واتە : كاری پێ ناكرێت یان نامۆیە .

285- **القراءة** : خوێندنەوەی قورئان .

بریتیە لەوەی گێڕەرەوەكانی لە یەكێك لە حەوت یان دە پێشەواكە لە سەری پێكهاتوون , یان هەر پێشەواو خاوەن هەڵبژاردنێك كە لە پلەوپایەی ئەواندا بێت . یان , خوێندنەوەی قورئان بە بەردەوامی بە دوای یەكدا .یان , فێربوون و وەرگرتن لە زاناو مامۆستایانەوە .

286- **قراءات الحروف** :فێربوونی جیاوازییەكان .

وەرگرتنی جیاوازی نیوان پێشەوایانی قیرائات بە تەنها بەبێ خوێندنەوەی قورئان پێشی دەوترێت رواية الحرف ) و ( سماع الحرف ) واتە : گێڕانەوەو بیستنی جیاوازییەكان , چونكە بە خوێندنەوەی قوتابی دەبێت بۆ مامۆستاكەی و بە پێچەوانەش .

287- **القراءات سنة** : قورئان خوێندن بە قیرائات سونەتە :

وەرگرتنی قیرائات لە لەلایەن دواینەکان لە پێشینەکان , بە زنجیرە ئیسنادی ( متواتر ) لە ڕێگەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم : ئەمەش ئەو قیرائاتانە دەگرێتەوە کە ڕێك و گونجاون لە گەڵ شێوازو ڕێنووسی ئەو موسحەفانەی کۆتا بە ڕوخستن و خوێندنەوەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە خۆ گرتووە , بۆ جیبریل سەلامی خوای لێ بێت .

288- القُرّاء :خوێنەرەکان .

مەبەست لە پێشەوایانی قورئان خوێنە .

289- القرينتان :

مەبەست لە هەردوو سورەتی ( الانفال ) و ( براءة ) یە .

290- القصر :کورتکردنەوە .

- واز هێنان لە زیادەی درێژکردنەوەی .
- لەلای پێشینان : بزواندنی پیتی هائی ( كناية ) بەبێ درێژکردنەوە .
- خوێندنەوەی وشەیەك بەبێ درێژکردنەوە , وەکو ( ملك ) .

291- القطع :بڕین .

- لەلای هەندێك لە زانا پێشینەکان بە ( سكت ) بێ دەنگی دەوترێت , هەروەها پێی دەوترێت ( التقطيع ) واتە : بەش بەش کردن .

292- **القلب** :هەڵگێڕانەوە .

- دانانی وشەیەك لە جێگەی وشەیەکی تر .
- هەندێ لە حوکمەکانی (تسهیل الهمزه ) ئاسانکردنەوەی هەمزە دەگرێتەوە .

293- **القیاس** : پێواندن .

دانانی لق وەکو بنچینە بە بۆنەی هۆکارێکی کۆکەرەوە لە نێوانیاندا , ئەمەش لە زانستی قیرائات دەبێتە دوو جۆر .

- پێوانەی ڕەها : کە بنچینەیەکی نیە لە زانستی قیرائات پشتی پێ ببەسترێت , وەکو پێواندنی ئەوەی کە ناگێڕدرێتەوە لە سەر ئەوەی کە گێڕدراوەتەوە بۆ نموونە : حوکمەکانی پێواندنی پیتی (م ) ی هەڵگەڕاوە لە نون و تەنوین لە سەر پیتی میمی ڕەسەن .
- پیتی (ن) و تەنوین لە سەر پیتی میمی ڕەسەن , ئەم جۆرە پێواندنەش قەدەغەیە , چونکە شێوازی خوێندنەوەی قورئان ڕێبازێکی ڕەچاوکراوە و سونەتێکی کارپێکراوە لە ڕیوایەت و دانیشتنی قوتابی لە بەردەم مامۆستادا سەرچاوە دەگرێت .
- پێواندنێك کە سەرچاوە دەگرێت لە یەکدەنگیەکی دروستبوو یان بنەمایەکی متمانە پێکراو , لەم حاڵەتە پێویستە پێواندن ئەنجام

بدرێت لە کاتی ناچاری و پێویستیدا سەبارەت بە مەسەلەیەك دەقێکی ڕاشکاو لە پێشەوایانەوە دەربارەی نەهاتبێت , ئەمەش لە بابەتی ئەوەیە کەبەش بدرێتە پاڵ سەرەکی و لق بگێڕدرێتەوە بۆ بنچینەو سەرچاوە , وەکو ئەوەی کە هەڵبژێردراوە سەبارەت بە سووکردنەوەی هەندێ لە جۆرەکانی پیتی هەمزە.

• بنچینەش لە قیرائاتدا ئەوەیە کە پشت بە پێواندن ببەستێت و بەڵکو تەنها ریوایەت سەرچاوەی بێت , باجیاوازو ناکۆکیش بێت لە گەڵ (قیاس ) دا لەم بارەشەوە پێشەوا (الشاطبي ) کە لە ساڵی (590) ك وەفاتی کردووە دەفەرموێت :

وما لقياس في القراءة مدخل فدونك مافيه الرضا متقبلا.

واتە : هیچ ڕێگایەك نییە بۆ پەنابردنە بەر (قیاس ) پێواندن لە قیرائاتدا , بۆیە بەوە کار بکە کە ڕەزامەندی پەروەردگاری تێدا دەستەبەر دەکرێت لە هەڵەکردن .

# پیتی ( ك )

**294- الكتاب :**

شێوازی ڕێنووسی موسحەفی عوسمانی .

**295- الكسر:** ژێر .

- بەبزوێنی ژێر دەوترێت کە ناسراوە .
- لە لای زۆرێك لە زانا دێرینەکان بە لارکردنەوە ( إمالة ) دەوترێت , چونکە پیتی لارکراو لە کەسرە نزیك دەبێتەوە .

**296-كفى :** بەسە .

هێمایەکە لە کتێبی ( طيبة النشر في القراءات العشر ) ئاماژەی پێ دەکرێت بۆ قورئانخوێنانی کووفە , کە بریتین لە ( عاصم بن أبي النجود ك د 127 ك ) , ( حمزة الزيات ك د 156 ك ) , ( الكسائي ك د 189 ك ) , ( خلف البزار 229ك )

297- **کنز:**گه نجینه

له (طيبة النشر في القراءات العشر) ئـاماژەپیی دەکرێت بو (إبن عامر الشامي) و(عاصم بن أبي النجود) و(حمزه الزيات) و(الكسائي) و(خلف البزار).

298- **كوف :**بڕوانه : أهل الكوفه .

299-**كوفى :**بڕوانه : أهل الكوفه .

300- **الوفيون :**بڕوانه : أهل الكوفه .

# پیتی ( لام )

301- **اللين :**نەرمیی .

- پیتی ( ي - ن ) ئەگەر ساکن بن و پێشی خۆیان سەری هەبێت , وەکو ( خوف ) ( بيت ) , ئەم پێناسە یە ناوبانگی لای زانایان .
- هەندێ لە زانایان زاراوەی ( اللين ) بەرێکردنی دەنگ پێناسە دەکەن لە گەڵ سێ پیتەکانی ( مد ) کە بریتین لە ( أ . و . ي ) کە لە وشەی ( نوحيها ) کۆ بوونەتەوە .
- ئەگەر ساکن بن و پێشی خۆیان لە چەشنی خۆیان بن , چونکە بەنەرمی و بەبێ زۆر کە خۆکردن دەردەچن .

302- **اللي :**بڕوانە : الإمالة .

# پیتی ( م )

303- **مالم يُسَمّ فاعله** :ئەوەی كە بكەرەكەی دیاری نەكراوە . بكەری نادیار ( المبنى للمجهول ) پێشەوایان ئەم زاراوەیە بەم دەستەواژەیە بەكاردەهێنن , چونكە زۆرجار بكەر خوای گەورەیە , بۆیە لە ڕووی ئەدەبەوە ئەوەیان بەكارهێناوە .

304- **ماءات القران** : پیتەكانی ( ما ) لە قورئاندا .

جۆرەكانی ( ما ) لە قورئاندا جیاوازییان هەیە لە ڕووی دەربڕینەوە , چونكە جێگیر بووە , كە زانایانی زانستی قیرائات جیاوازی دەكەن پیتەكانی ( ما ) بە پێی واتاكانیان , بەرزترین دەنگ تیایاندا بۆ ( ما ) ی نكۆڵی كردن و ئینجا ( ما ) ی سەرسوڕمان و پرسیار , جگەلەوانەش وشەكانی تری ( ما ) دەنگ لە دەربڕینیاندا دادەبەزێ وەكو پیتەكانی تر , ئەمەش لە ڕاستیدا كۆنترۆڵ ناكرێت بە دانیشتن نەبێت لە بەر دەستی مامۆستای لێهاتوو .

305- **المبين**:بڕوانە : الإظهار .

306- **متوسط بزائد** :

واتە : هەمزەی سەرەتای وشە لکابێتە پیتێکی زیادەوە لە ڕووی ڕێنووس و دەربڕینەوە , وەکو ( بأسماء ) البقرة , یان لە ڕووی دەربڕینەوە وەکو ( وفي أنفسكم ) الذاريات / 21 , ئەمەش پێی دەوترێت ( المتوسط بغيره ) واتە : هەمزەی ناوڕاستی لکاو بە پیتێکی تر .

307- **متوسط بغيره :** بڕوانە : متوسط بزائد .

308- **متوسط بنفسه :** هەمزەی بنەڕەتی لە ناوڕاستی وشە , ئەم جۆرە بریتییە لەو هەمزەی کە دەکەوێتە ناوەڕاستی وشەوە و لە پێکهاتەی ئەو وشەدایە , وەکو : ( والمؤمنون و المؤمنات )التوبة /71.

309- **المجردة :** بڕوانە : المفردة .

310- **المجرى :** بڕوانە : الاجرا ء .

311- **مدا :**

لە کتێبی ( طيبة النشر في القراءات العشر ) ئاماژەی پێ دەکرێت بۆ ( أبو جعفر المدني ك د 310 ك ) , ( نافع المدني ك د 169 ) .

312- **المد :** درێژکردنەوە :

- درێژکردنەوەی دەنگ بە یەکێك لە پیتەکانی درێژکردنەوە لە بەر هۆکارێك لە دەربڕینی وشەکەدایە وەکو هەمزەو سکون , یان لە ڕووی

واتایەوە کە هەندێ زانا دێرینەکان بە ( المد المتكلف ) و ( المد المزيدى ) و ( المط ) و ( المطل ) دەربڕینی لێ دەکەن .

- خوێندنەوەی وشەکە بە جێگیرکردنی پیتی ( مد ) درێژکردنەوە تێدا وەکو ( مالك ) .
- مد الأصل : درێژکردنەوەی بنچینەیی .

بەو درێژکردنەوە دەوترێت کە لە بچینەی وشەکەدا بێت , وەکو ( جا ء ) و ( زاغ ) .

313- **المد الأصلي :** درێژکردنەوەی بنچینەیی . بەو درێژکردنەوە دەوترێت کە لە بچینەی وشەکەدا بێت , وەکو ( جا ء ) و ( زاغ ) .

314- **المد الاصلي :** بڕوانە : المد الطبيعي .

315- **المدبرة :** بڕوانە : التدبير .

316- **مد البدل :** درێژکردنەوەی لە جیاتی .

بریتیە لەوەی پیتی هەمزە بکەوێتە پێش پیتی ( مد ) لەناو یەك وشەدا , وەکو ( او منوا ) چونکە درێژکردنەوەکە لە جیاتی پیتی هەمزەی دووەمە کە پێی دەوترێت ( مد الخارجة ) واتە درێژکردنەوەی دەرچوو .

زۆربەی زانایانیش پێناسەیان بۆ مەددی بەدەل ئەوەیە پیتی هەمزەکە بکەوێتە پێش پیتی درێژکردنەوە , ئیتر ئایا ئەو درێژکردنەوەیە لە

پیتێکی تر هەڵگەڕابێتەوە یان بنچینەیی بێت , هەندێکیش لە زانایان جیایان دەکەنەوەو ئەوەی کە درێژکردنەکە تێدا بنچینەیی بێت و گۆڕدراونەبێت وەکو ( یؤوس ) پێ دەڵێن ( شبیه البدل ) .

317- **مد البسط:** بڕوانە المد المنفصل .

318- **مد البنیة:** بڕوانە : المد المتصل .

319- **مد التبرئة :** درێژ کردنەوەی بێ بەری بوون

درێژکردنەوەی ( لا ) ی ئەوەندەی دوو پیتی ئەلیف ( چوار جووڵە ) لە ڕێگەی پێشەوا ( حمزة ك د 156ك ) بۆ نموونە ( لاریب ) البقرة / 2 .

320- **مد التعظیم:** درێژکردنەوەی بەمەزن ڕاگرتن .

درێژکردنەوەی ( لا ) ەئەگەر بکەوێتە پێش وشەی ( الە ) وەکو ( الله لا الە الا هو الحی القیوم ) البقرە / 255 . لە هەر شوێنێکی قورئاندا بێت لەو پێشەوایانەوە کە ( قصر المنفصل ) دەخوێنن کاتێك لێرە بە مام ناوەندی دەخوێنن لە وشەی ( لا ) پێشی دەوترێت ( مد المبالغة ) واتە : جەختکردنەوەی لەسەر درێژکردنەوەی بۆ زیاتر نکۆڵی کردن لە خوایەتی هەرکەسێك جگە لە خوای گەورە .

321- **مد التمکین:** درێژکردنەوەی چەسپاندن .

- بەهەموو درێژکردنەوە لاوەکییەکان (المدود الفرعية ) دەوترێت کە زیاترن لە ئەندازەی درێژکردنەوەی ئاسایی , لەوانە : درێژکردنەوەکانی (المتصل والمنفصل واللازم ) , دەوترێت : ( تمكين ) ئەگەر مەبەست لە زیادکردن بێت .
- درێژکردنەوەی ئاسایی لە ڕووی ئەوەی کە جووڵەکەی بەهێزترە (ي ) زنەدار ئەگەر پێشی خۆی ژێری هەبێت و پیتێکی تری ( ي ) بەدوایدابێت , هەروەها پیتی ( و ) ی زنندار ئەگەر پێشی خۆی بۆری هەبێت (و ) ی بەدوادا بێت , وەکو فەرموودەی خوای گەورە (الذي يدع ) الماعون / 2 و (آمنوا وعملوا ) البقره / 25 . پێویستە ئەو دوو پیتە بە تەواوی و بە جوانی دەربخرێت بە ئەندازەی درێژکردنەوەی ئاسایی نەوەك تێهەڵکێش بکرێن یان لابرێن .

322- **المد الثابت :**بڕوانە : المد اللازم .

323- **المد الجائز :**بڕوانە : المد المنفصل , المد العارض .

324- **مد الحجز :**درێژکردنەوەی بەربەست , تێخستنی پیتێکی ئەلیف بە ئەندازەی دوو جووڵە لە نیوان دوو هەمزەی بە دوای یەکدا هاتوو , وەکو ( أ أنت ) لە لای هەندێك لە پێشەوایانی قیرائات , بۆیەش ناونراوە (مد الحجز ) چونکە بەربەست دروست دەکات لە نیوان

دوو هەمزەداو لە یەکتریان دوور دەخاتەوە , پێشی دەوترێت ( المد الفاصل ) و زیاتریش بە ( الإدخال ) دەناسرێت .

- ئەو مەددەی کە دەکەوێتە نێوان ڕاوەستاوێك و بزواوێکدا , کەمەددی پێویستە ( المد اللازم ) , وەکو : ( دابە ) .

325- **المدالخفي :** درێژکردنەوەی شاراوە .

درێژکردنەوەی ئەو ئەلیفەی کە گۆڕدراوە لە هەمزەوە بە ئەندازەی سێ پیتی ئەلیف ( 6 جووڵە ) وەکو : ( أرأيت ) بە پێی ریوایەتی وەرش , بۆیەش ئەو ناوەی لێ نراوە چونکە هەمزەکە شاراوەیە بەوەی کە گۆڕدراوە بۆ ئەلیف .

326- **المد الذاتي :** بڕوانە : المد الطبيعى .

327- **مدالروم :** درێژکردنەوەی ویستن .

پیتی درێژکردنەوەی پێش هەمزەی ئاسانکراو بە پێی هەندێ قیرائات , وەکو ئاسانکردنەوەی هەمزەی وشەی ( اسرائيل )

328- **مدالصلة :** درێژکردنەوەی پێکەگەیاندن .

مەبەست لەو مەددەیە لە دوای پیتی ( م ) ی کۆ دێت , لە لای ئەوانەی دەیگەیەنن بە پیتێکی ( و ) لە دەربڕیندا کە بکەوێتە پێش پیتێکی جوڵاو .

**329- مد الصيغة** :بڕوانە : المد الطبيعي .

**330- المد الطبيعي** :درێژكردنەوەی ئاسایی .

بریتییە لەو درێژكردنەوەی كە خودی پیتەكە دەرنابڕدرێت بەبێ ئەو درێژكردنەوەیە , هەروەها پێشی دەوترێت (المد المقصور ) واتە : درێژكردنەوەی كورتكراو , لەبەرئەوەی لەو مەددە كورتترە كە بە هۆی هەمزەوە درێژ دەكرێتەوە , پێی دەوترێت (المد الاصلي ) و ( المد الذاتي ) و (مد الصيغة ) .

**331- المد العارض** :درێژكردنەوەی تووشهاتوو .

بریتییە لەوەی كە زیادەیەك لە مەددا دروست دەبێت بە هۆی ڕاوەستان یان تێهەڵكێشان,جۆرێكیشە لە جۆرەكانی مەددی جائیز و دەبێت بە دووبەشەوە :

أ- المد العارض للأدغام :واتە : درێژكردنەوەی تووش هاتوو تێهەڵكێشانی (م ) لە گەڵ (م ) لە (الرحيم ملك ) لە سورەتی (الفا تحه ) كە هەرسێ حاڵەتی (قصر ) و (توسط ) و (اشباع ) تێدا جائیزن .

ب- المد العارض للوقف : درێژكردنەوەی تووش هاتوو بۆ ڕاوەستان بریتییە لەوەی لە دوای درێژكردنەوە یان ( لين ) پیتێكی ڕاوەستاو (ساكن ) ی توشهاتوو هاتبێت , بۆ نموونە ڕاوەستان لە سەر ووشەی

( الرحيم ) يان ( بَيت ) كە دەكرێت بە ( قصر ) و ( توسط ) و ( اشباع ) بێت , واتە ( 2-4-6 ) جووڵە .

**332- مد العدل:** درێژكردنەوەی يەكسانی .

- مەددی لازم , وەكو ( دابة ) چونكە لە سەر بۆچوونی پەسەند يەكسانە لە لای پێشەوايانی قيرائات لە ڕووی درێژكردنەوەی بە ( اشباع ) واتە شەش جووڵە .
- تێخستنی ئەليفێك بە ئەندازەی دوو جووڵە لە نيوان دوو هەمزەی بە دوای يەكدا هاتوو , وەكو : ( أ ا أنت ) لە لای هەندێك لە پێشەوايانی قيرائات .

**333-المد العرضي :** درێژكردنەوەی لە ناكاو .

مەبەست لە ئەو درێژكردنەوەيە لە سەرووی درێژكردنەوەی ئاسايی لە بەر هۆكارێك بۆ نموونە بە هۆی پيتی هەمزەو هۆكاری تر هەموو جۆرە مەددە نابنەڕەتيەكانيش دەگرێتەوە , پێشی دەوترێت ( المد الفرعی ) و ( المد المزيدی ) و ( المد المتكلف ) .

**334- مد العوض :** درێژكردنەوەی لە جياتی .

- ئەودرێژكردنەوەی كە لە پيتی ( ه ) ی ڕاناو دا هەيە كە ئاماژەبێت بۆ تاكی ئامادە نەبوو كە پاشكۆی كردارێك بێت ( ی ) لێ كرابێتەوە بە

هۆی ( جزم ) و لە جیاتی ئەوەش بە ( ه ) ی ڕاناو قەرەبوو كراوەتەوە , وەكو فەرموودەی خوای گەورە ( نوله ) النساء / 115 .

- ئەو مەددەی كە لە تێهەڵكێشانی گەورە سەرچاوە دەگرێت , وەكو فەرموودەی خوای گەورە ( كيف فعل ربك ) الفجر / 6 .

335- **المد الفاصل:** بڕوانە : الفصل , مد الحجز .

336- **المد الفرعي :** بڕوانە : المد العرضي .

337- **مد الفرق :**

ئەو درێژكردنەوەی كە پرسیار ( استفهام ) و هەواڵ ( خبر ) لە یەكتر جیا دەكاتەوە , وەكو فەرموودەی خوای گەورە : ( ءالذكرين ) 0 9 143- 144.

و ( ءالئن ) يونس / 51, 91 . هەر لەم بارەشەوە وشەی ( السحر ) بە پێتی قیرائەتی پێشەوا ( أبی عمر و البصرى ك154ك ) بەڵام بە پێی قیرائەتی پێشەوایانی تر مەددی تێدانییەو وەكو هەواڵ هاتووە , هەموویشی بە مەددی ( لازم ) دەژمێردرێت و بە ئەندازەی سێ پیتی ئەلیف درێژ دەكرێتەوە ( شەش جووڵە )

338- **مد الفصل :** بڕوانە : المد المنفصل .

339- **مد الكلمة :** درێژكردنەوەی وشە .

بریتییە لەوەی پیتی درێژکردنەوە ( مد ) و هەمزە لە ناو یەك وشەدا بێت , وەکو : ( أولئك ) , کە ئەوەش بە ( المد المتصل ) ناسراوە .

340 - **المد اللازم :** درێژ کردنەوەی هۆگر .

بریتیە لەوەی لە پاش پیتی درێژکردنەوە پیتێکی ڕاوەستاو ( ساکن ) ی ڕاستەقینە ( واتە : لە هەردوو حاڵەتی ڕاوەستان و بەردەوام بووندا هەر ڕاوەستاو بێت ) یان هۆکاری ناو نانەکەی لە بەر ئەوەیە کە لەلای پێشەوایانی قیرائات درێژ کردنەوەی تێروتەسەل دەکرێت بە ئەندازەی سێ پیتی ئەلیف ( شەش جووڵە ) هەندێ نازناوی تریشی هەیە بە پێی جۆرەکەی و ئەوەی لە پاشیەوە دێت , جا ئەگەر درێژکردنەوەکە لەوشەیەکدا بوو لە پاشیەوە پیتی شەددار هاتبوو پێی دەوترێت درێژکردنەوەی پەیوەستی وشەیی قورسکراو ( المد اللازم الكلمى المثقل ) وەکو : ( الصاخه ) عبس / 78 . بەڵام ئەگەر پیتی دوای پیتی مەددەکە شەددار نەبوو پێی دەوترێت : درێژکردنەوەی پەیوەستی وشەیی سووککراو , وەکو ( ء آلئن ) یونس / 51, 91 . ئەگەر درێژکردنەوەکەش لە سەرەتای سورەتەکاندا بوو و لە سێ پیت پێکهاتبوو ناوڕاستەکەی پیتی درێژکردنەوە بوو سێیەمیان ڕاوەستاو ( ساکن ) بوو پێی دەوترێت درێژکردنەوەی پەیوەستی پیتی ( المد اللازم

الحرفی ) ئەگەر تێهەڵکێش بێت لە گەڵ پاشی خۆی پێی دەوترێت درێژکردنەوەی پەیوەستی پیتی تێهەڵکێشراو (المد اللازم الحرفی المدغم ) وەکو پیتی لام لە سەرەتای سورەتی البقره , بەلاّم ئەگەر لە پاش خۆی تێهەڵکێش نەبوو پێی دەوترێت درێژکردنەوەی پەیوەستی پیتی سووککراو (المد اللازم الحرفی المخفف ) وەکو پیتی میم لە سەرەتای سورەتی البقرة .

341- **المد اللازم الحرفي :**بڕوانە : المد اللازم .

342- **المد اللازم الحرفي :**المثقل : بڕوانە المد اللازم .

343- **المد اللازم الحرفي :**المخفف : بڕوانە المد اللازم .

344- **المد اللازم الحرفي :**المدغم : بڕوانە المد اللازم .

345-**المد اللازم الكلمي :**بڕوانە : المد اللازم .

346-**المد اللازم الكلمي :** المثقل : بڕوانە : المد اللازم .

347-**المد اللازم الكلمي المخفف:**بڕوانە : المد اللازم .

348-**مد اللين :**درێژکردنەوەی ئاسان .

ئەو درێژکردنەوەیە کە لە هەردوو پیتی (ي ) و ( و ) ڕاوەستاودا هەیە کە پێشی خۆیان سەر (فتحة ) ی هەبێت , وەکو (خوف ) و ( بيت ) .

349- **مد المبالغة**:بڕوانە : مد التعظيم .

350- **المد المتصل** :درێژکردنەوەی بە یەکگەیشتوو .

واتە: لە ناو یەك پیتدا یەکەم جار پیتی درێژکردنەوە هاتبێت و بە دوایدا هەمزە هاتبێت , وەکو (شاء ) پێشی دەوترێت درێژکردنەوەی بنەڕەتی ( مد البنية ) چونکە وشەکە لە سەر درێژ کردنەوە بونیات نراوە , هەروەها پێی دەوترێت درێژکردنەوەی پێویست (المد الواجب ) چونکە پێشەوایانی قیرائات یەکدەنگن لە سەر پێویستی درێژکردنەوەی ئەگەر چی لە ئەندازەکەیدا جیاوازیان لە نیواندا هەیە , پێشی دەوترێت درێژکردنەوەی گونجاو ( المد الممكن ) چونکە خوێنەری قورئان ناتوانێت هەمزە بە باشی جێبەجێ بکات ئەگەر لەو ڕێگەوە نەبێت .

351- **المد المتكلف** : بڕوانە : المد العرضي .

352- **المد المتوسط** : درێژکردنەوەی ناوەندی .

ئەو درێژکردنەوەیە کە دەکەوێتە نیوان دوو پیتی هەمزە لە نێو یەك وشەدا , بۆ نموونە : ( رئاء ) البقره / 264 , کە لە ڕیزی درێژکردنەوەی پێویست (المد الواجب ) دەژمێردرێت .

353- **مد المجتلبة**: درێژکردنەوەی هێنراو .

ئەو درێژكرنەوانە دەگرێتەوە كە لە بنچینەی وشەكەدا نییە , كە ( مد الفرق ) و ( مد الحجز ) دەگرێتەوە و لە جۆری درێژكردنەوەی بە یەكگەیشتوو دەژمێردرێت .

354- **المد المزيدى :**بڕوانە : المد العرضي .

355- **المد المشبع :**درێژكردنەوەی تێروتەسەل .

واتە : درێژكردنەوە بە ئەندازەی سێ پیتی ئەلیف ( شەش جووڵە )

356- **المد المقصور :**بڕوانە المد المتصل الطبيعي .

357- **المد الممكن :**بڕوانە . المد المتصل .

358- **المد المنفصل :**درێژكردنەوەی نەلكاو .

واتە : پیتی درێژكردنەوە لە كۆتای وشەكەدا بێت و , پیتی هەمزە لە سەرەتای وشەی دوای ئەوە دابێت , وەكو ئەو دوو درێژكردنەوەی لە فەرموودەی خوای گەورە : ( بما أنزل اليك وماأنزل من قبلك ) البقرة / 4 . پێشی دەوترێت ( مد البسط ) و ( مد الفصل ) و ( مد حرف لحرف ) و ( المد الجائز ) چونكە جیاوازی لە نیوان زانایاندا هەیە سەبارەت بە درێژ كردنەو كورتكردنەوەی .

359- **مد الهجا ء اللا لازم** :درێژکردنەوەی پیتی ناپەیوەست ئەو درێژکردنەوەی لە سەرەتای سورەتەکانەوە هەیە کە لە دوو پیدایە وەکو : ( طه ) , بۆیەش ناونراوە ناپەیوەست چونکە درێژکردنەوەی لە سەر دوو جوڵە کورت هەڵهاتوە , چونکە بە درێژکردنەوەی ئاسایی دەژمێردرێت .

360- **مد الهجاء اللازم** :بڕوانە المد اللازم .

361- **المد الواجب** :بڕوانە المد المتصل .

362- **مد إمعان** :درێژکردنەوەی وردبوونەوە .

درێژکردنەوەی ئاسان ( مد اللين ) ئەگەر پیتی هەمزەی بەدوادا بێت وەکو ( شيئا ) بە ئەندازەی دوو یان سیٚ پیتی ئەلیف لە لای وەرش ( ك د 197 ك ) لە ڕێگەی ( الازرق ك د لە دەوروبەری 40, ك ) .

363- **مد حرف لحرف** : بڕوانە المد المنفصل .

364- **مدُ ما** :درێژکردنەوە بە ئەندازەیەك .

درێژکردنەوە بە ئەندازەی نزیك پیتی ئەلیف , واتە : بە ئەندازەی یەك جووڵە کە لە درێژکردنەوەی ئاسایی ( المد الطبيعي ) کەمترە , ئەوەش ڕێك ناخرێت بە دانیشتن نەبێت لە بەر دەستی مامۆستایەکی

شارەزادا , تەنها لە هەردوو پیتەکەی ( لین ) دا هەیە , کەبریتین لە ( و ) و ( ي ) کە پێشیان سەری هەبێ وەکو : ( خوف ) و ( بیت ) لە کاتی بەردەوام بوون نەك ڕاوەستاندا .

365- **المد و اللين :**درێژکردنەوەو ئاسانی .

دوو سیفەتی پەیوەستن بە درێژبوونەوەی دەنگ و نەرمییەوە , ئەوەش لە پیتی ئەلیف و , پیتی ( ي ) کە پێش خۆی ژێر ( کسرة ) ی هەبێت و پیتی ( و ) ڕاوەستاو بێت و پێش خۆی بۆر ( ضمة ) ی هەبێت .

366- **مدات القرآن :**درێژکردنەوەکانی قورئان .

جۆرەکانی درێژکردنەوەی بنچینەیی و لاوەکی دەگرێتەوە چەندین جۆرو لق و نازناوی زۆری هەیە , هەمە جۆری و زۆری و کەمی ئەندازەکەشی بۆ هەمزەو سکون دەگەڕێتەوە , کە هۆکاری سەرەکی درێژکردنەوەن .

367- **مد الخارجة :**بڕوانە : مد البدل .

368- **مدني :**بڕوانە : أهل المدينة .

369- **المدنيان :** بڕوانە : أهل المدينة .

370- **المذهب :**بڕوانە : الأصول .

371- **المراقبة فى الوقف :**چاودێری لە ڕاوەستاندا .

مەبەست لەوەیە كە دەكەوێتە نێوان دوو ڕاوەستانەوە , كە ئەگەر خوێنەر لە سەر یەكێكیان ڕاوەستا نابێت لە سەر ئەوی تر ڕاوەستێت , وەكو ئەوەی لە فەرموودەی خوای گەورەدا : ﴿ذلك الكتب لاريب فيه هدى للمتقين﴾ البقرة / 2 .

ئەوەی بە ڕاوەستانی لە سەر ( لاريب ) بە جائیز زانیوە , بە جائیزی نەزانیوە لە سەر ( فيه ) ڕاوەستیّ , یان ئەگەر لە سەر ( فيه ) ڕاوەستا ئیتر ناگونجێت لە سەر ( لاريب ) ڕاوەستیّ , ئەمەش بە یەككگرتنی ڕاوەستان ( تعانق الوقف ) ناسراوە .

372- **مرسوم الخط :** بڕوانە : رسم المصحف .

373- **المصاحف العثمانية :** موسحەفە عوسمانیەكان مەبەست لەو موسحەفانەیە كە عوسمانی كوڕی عەفان ڕەزای خوای لێبێت ( ك د 35 ك ) ناردنی بۆ دەڤەرەكانی مەككەو مەدینە و شام و كوفە و بەسرە , ئوممەتیش هەموو یەكدەنگن لە سەر ئەوەی كە لە دوو توێیاندا هاتووە , ئەوەش جیاوازی تیابوو لە ڕووی زیادەو نوقسانی و گۆڕینی وشەیەك بە وشەیەكی تر كە پێشتر مۆڵەتی پێدرابوو لە ڕووی فراوانكردن لە سەریان یان مەرجی ( تواتر )ی تێدا نەبوو , هەمووی لابرد .

374- **مصحف الإمام :** موسحەفی پێشەوا.

موسحەفی پێشەوا فەرمانڕەوای باوەڕداران ( عوسمان بن عفان ک د 35ك ) کە گلی دابویەوە بۆ خوێندنەوەی خۆی .

• مەبەست پێی ڕەگەزە , واتە : موسحەفەکەی عوسمان ڕەزای خوای لێبێت و هەموو موسحەفێکی تر دەگرێتەوە لە وانەی کە ناردنی بۆ دەڤەرەکان , لەم حاڵەتەشدا بە زۆری ( ال ) لی بۆ بەکاردێت و دەوترێت : ( المصحف الامام ) .

375- **المط** :بڕوانە : المد .

376- **المطل** :بڕوانە : المد .

377- **المفردة**:تەرخانکراو .

مەبەست لەو کتێبانەیە کە لە سەر قیرائەتێکی سەربەخۆ نووسراوە , پێشی دەوترێت ( المجرده ) .

378- **المقاريء** :بروانە : المقرأ .

379- **مقاصد القراءات** :مەبەستی قیرائەتەکان .

بریتیە لەوەی توێژینەوەو گەڕان تێدا دەگێردرێتەوە بۆ ڕێکەوتن و جیاوازی پێشەوایانی قیرائات , کە ئەوەش بنچینەکان ( ألاصول ) و وشە تایبەتەکان ( الفرش ) دەگرێتەوە.

380- **المُقرِيء :**زانا لە قیرائات .

مەبەست لەم زاراوەیە زانای ئەم زانستەو ئەو کەسانەیە کە بە زارەکی دەیگێڕنەوە .

381- **المقرأ :** خوێندنەوە , کتێبی تایبەت بە قیرائەتێك.

- چاوگە بە واتای خوێندنەوە , دەوترێت : ( مقرأ نافع ) .

واتە : خوێندنەوەکەی , بە ( المقاريء ) کۆدەکرێتەوە .

- مەبەست لەو کتێبانەیە کە لە قیرائەتێکدا یان زیاتر نوسراون , بۆ نموونە دەوترێت (مقرأ نافع ) واتە : ئەو کتێبەی کە باسی قیرائەتەکەی دەکات .

- هەروەها زاراوەی ( المقاریء ) بە بازنەکانی فێرکردنی قیرائات دەوترێت .

382- **الكنى :**وەکو ( هم هما ) و شتی لەو جۆرە .

383- **المكي :**مەککەیی .

مەبەست لەم زاراوەیە لە نێو حەوت پێشەوایانی قیرائات ( أبن كثير المكي ) ە , لە نێو چواردەكە ش ( ابن محيصن المكي ) ش دەگرێتەوە , پێیشیان دەوترێت ( المكيیان ) یان ( اهل مكة ) .

384- المكي :بڕوانە : المكی .

385- المكيیان : بڕوانە : المكی .

386- المهموز :المختلس : هەمزەیەك یائی بە دوادا نەهاتبێت لە لای هەندێ لە زانا دێرینە كان ئەو وشە دەگرێتەوە كە هەمزەیەكی تێدابێت و پیتی ( ي )ی مەددی بەدوادا نەهاتبێت , وەكو : ( میكائل ) .

387- المهموز المشبع :هەمزەداری درێژكراوە .

لەلای هەندێ لەزانا دێرینەكان بریتییە لەو ووشەی كە هەمزەیەكی تێدایە و پیتی یائی درێژكراوەی بە دوادا نەهاتووە , وەكو : ( جبرائیل )

388- موافقة الرسم :بڕوانە رسم المصحف .

389- میم :میمی كۆ .

ئەو میمەزیادەیە كە ئاماژە بۆ كۆمەڵی نێرەكان دەكات چی لە ڕووی ڕاستی یان دابەزاندن بێت , وەكو ( عليهم غير ) هەروەها ( میم الجمیع ) ی پێ دەوترێت .

390- **میم الجمیع :** بڕوانە میم الجمع .

391- **میمات نُصیر :** میمەکانی نوسەیر .

بریتیە لەو میمانەی کۆ بە خوێندنەوەی ( نصیر بن رستم الکسائی ك د 189ك ) کە بە پیتێکی میم یان بە هەمزە گەیشتبێت کە کۆتای ئایەتەکانەوە بە پێی هەندێ مەرج و بنەمای شیکراوە . ڕیوایەتی ( نصیر ) ئەگەر چی بە ( متواتر ) ناژمێردرێت , بەڵام ئەوەی کە سەبارەت بە میمەکان ڕیوایەتی کردووە بەدەر نییە لە قیرائاتە ( متواتر ) ە کان , وەکو قیرائەتی ( نافع ) و ( أبن کثیر )

# پیتی ( ن )

392- **النبر** :توندی .

زۆرینە لە سەر ئەوەن کە سیفەتێکە بۆ پیتی هەمزە بە واتـای توندی دێت , هەروەها ( النبرة ) شی پێ دەوترێت , دەشگێڕنەوە , کەبریتیە لە بە ئـاسان دەربڕینی پیتی هەمزە بە شێوازێك زۆربەی بڕوات و بە سووکی دەربڕێت وەکو هەمزەیەکی درێژنەکراوەی مام نـاوەندی .

393- **النبرة** :بڕوانە النبر .

394- **النحويان** :هەردوو زمان زانەکە .

مەبەست لە ( أبی عمرو البصري ك د 154 ك ) و ( الكسائي ك د 189 ك ە) .

395- **النصب** :سەر .

- لەلای هەندێك لە زانا دێرینەکان ئەو سەرەیە کە لە بەرانبەر لارکردنەوە ( ألإماله ) دێت .
- بزوێنی سەرەکە .

396- **النص** : دەق .

ئەو رڕیوایەتە دەگرێتەوە کە لە پێشەواوە هاتووە , بریتیە لەوەی گوێزراوەتەوە لە ڕێگەی هەندێ لە پێشەوایانی قیرائات حەوت پێشەواکە  سەبارەت بە چۆنێتی خوێندنەوەیەك لە خوێندنەوەکان .

397- **نصف ألألف:** بڕوانە : الحركة .

398- **نفر :** کۆمەڵ .

لە کتێبی ( الشاطبية في القرا ءات السبع ) ئاماژەی پێدەکرێت بۆ ( ابن عامر الشامي ك د 118 ك ) و ( ابن كثير المكي ك د 120 ك ) و ( أبي عمر البصري ك د 154 ك )

399- **النقل :** گواستنەوە .

- گواستنەوەی بزوێنی هەمزەکە بۆ ڕاوەستاوی پێش خۆی هاوکات لە گەڵ لابردنی هەمزەکە .
- گواستنەوەی بزوێنی ئەو پیتەی لە سەری ڕاوەستاوی بۆ ڕاوەستاوی پێش خۆی لە حاڵەتی ڕاوەستاندا لە ترسی ئەوەی دوو ڕاوەستاو ( ساكن ) کۆنەبنەوە , وەکو ( منه ) و( عنه ) لە کاتی ڕاوەستاندا , ئەمەش کەس لە پێشەوایان کاریان پێ نەکردووە,مەگەر لە قیرائاتە نامۆکاندا بێت .

400- **النقلة :** گوێزەرەوەکان .

واتە : ئەو پێشەوایانەی زانستی قیرائات لە مامۆستاکانیانەوە بۆ مان گواستۆتەوە .

# پیتی ( ه )

401- ها ء الاستراحة :بڕوانه : ها ء السکت .

402- هاء التأنيث :هائی بەمێ کردن .

بریتییه لەو پیتی هائەی کە لە کاتی بەردەوام بووندا دەبێتە ( ت ) لە کۆتایی ناودا , وەکو : ( نعمة ) پێشی دەوترێت ( ه ), لە ڕوانگەی ڕاوەستان لە سەری .

403- ها ء السکت :واتە : هائی بێدەنگی .

بریتیه لە هائێکی ڕاوەستاو زیادکراوە لە کاتی ڕاوەستاندا بۆ دەرخستنی بزوێنەکە , لە کاتی بەردەوام بوونیشدا نامێنێ , بەڵام پێشەوایان جیاوازیان لە نیواندا هەیە دەربارەی , وەکو ( ماهیه ) القارعة / 10 , هەندێکیان لە بەردەوام بوون و ڕاوەستاندا جێگیری دەکات وەکو ڕەچاوکردنی شێوازی نووسینی موسحەفی عوسمان , ڕەزای خوای لێ بێت , هەندێکیشیان تەنها لە ڕاوەستاندا جێگیری دەکەن و لە بەردەوام بووندا

لایدەبەین بەپێی بنچینە زمانەوانییەكە ,لەم بارەشەوە هەموویان شوێنكەوتووی ڕیوایەت و گواستنەوەی , پێشی دەوترێت هائی پشوودان ( هاء الاستراحة ) چونكە لە بنچینەدا جێگای ڕاوەستانە بۆیە بە پشوودانێك بۆ خوێنەر دادەنرێت .

404- **هاء الضمير :**بڕوانە : ها ء الكناية .

405 - **هاء العوض :**هائی قەبوو.

بریتییە لەو پیتەی (ه) دەچێتە سەر (ما ) ی پرسیار كە لە پێشیەوە پیتێكی ژێردار هاتبێت , وەكو ڕاوەستان لە قیرائەتی یەعقوب وریوایەتی (البزي ) لە سەر (عم ) النبأ بە پیتی ( ه ) .

*چونكە پیتی (ه) لە جیاتی پیتی ئەلیفی لابراو لە كۆتایی وشەكەدا دانراوە و , پێشی دەوترێت ( ها ء السكت ) .

406- **ها ءالكنايه :**هائی نازناو .

بریتییە لەو پیتی هائەی كە دەربڕینی پێ دەكرێت لە تاكی نێرینەی نادیار ( المفرد المذكر الغائب ) بە ( هاء الضمير ) یش ناودەبرێت , وەكو : (بە ) و (لە ) یمان وەكو فەرموودەی خوای گەورە : ( خڎه فاعتلوه ) . (الدخان / 47 .

407- **الهمز الثابت :**هەمزەی جێگیر .

بریتییە لەو هەمزەی کە دەمێنێتەوە وەکو دەربڕین و شێواز .

408- **الهمز المجتمع:** بڕوانە : الهمز المزدوج .

409- **الهمز المزدوج :** هەمزەی دووانە .

بریتییە لەو دوو هەمزە پێکەوە لکاوە لە سەرەتای وشە , وەکو : ( أأنت )
پێشی دەوترێت ( الهمز المجتمع ) و ( الهمزتان من كلمة ) و ( الهمزتان من كلمتين ) .

410- **الهمز المغير:** هەمزەی گۆڕدراو .

ئەو هەمزەیە کە گۆڕینێکی بەسەرداهاتووە وەکو گواستنەوەو ئاسانکردن و گۆڕین .

411- **الهمز المفرد :** هەمزەی تاك .

بریتییە لەو هەمزەی کە نەلکاوە بە هەمزەیەکی تری هاوشێوەی خۆی وەکو : ( يأتى ) و ( مؤمن ) و ( يؤخر ) هەروەها پێی دەوترێت : ( الهمز المنفرد ) .

412- **الهمز المنفرد :** بڕوانە : الهمز المفرد .

413- **الهمزة المطولة :** هەمزەی درێژکراو .

بریتییە لەو هەمزە جێبەجێکراوەی کە هەمزەیەکی ئاسانکراوی بە دوادا هاتووە , هەروەها پێی دەوترێت : ( الهمزة المحدودة ) واتە : هەمزەی درێژکراوە .

414 - - الهمزة المحدودة: بڕوانە : الهمزة المطولة .

415- همزه بين بين : بڕوانە : بين بين .

416- الهمزة المدبرة: بڕوانە : التدبير .

417- همزة ومد : بڕوانە : الهمزه المحدوده .

418- الهمزتان في كلمة : بڕوانە : الهمز المزدوج .

419- الهمزتان في كلمتين: دوو هەمزە لە یەك وشەدا .

بریتییە لەو دوو هەمزەی بە دوایەکدا هاتووە , کە یەکەمیان لە کۆتای وشەی یەکەم بێت و , دووەمیان لە سەرەتای وشەی دوای ئەوە بێت , بێ ئەوەی پیتێك لە نیوانیاندا بێت , وەکو ( السفها ءألا ) البقرة / 13 .

یان (هؤلاء ان ) البقرة / 31.

# پیتی ( و )

420- **واقفه** : بە هەمان شێواز خوێندیەوە .

هەروەها پێ شی دەوتر ێت : (تابع ) وا تە : بەدووی کەوت , هەردووکیان بەیەك واتا دێن .

421- **الوجه** :شێواز .

- سەرپەر شتیکردنی خوێ نەر لە چۆنێتی خوێند نەوەی قور ئانی پیرۆز , وە کو برە کانی درێژکرد نەوە لە کاتی ڕاوەستاندا لە سەر (الوقف العارض للسكون ) .
- هەروەها بە خوێند نەوەو ڕیوا یەت و ڕێ گە (الا قراءة والروا یة والطر یق ) یش دەوتر ێت , لە ڕووی ژ مارەوە نەك لە ڕووی سەرپشککردن .

422- **وسائل القراءات** :هۆکارەکانی قیرائات .

بریتییە لەو ڕوانگەو باسانەی پەیوەستن بە زانستی قیرائاتەوە لە ڕووی پێویستی ئەو زانستە بەو باسانە , (البقاعي ك د 885 ك ) ئەو باسانەی لە حەوت بەشدا دیاریکردووە کە بریتین لە : زنجیرەی

ئێسنادەکان , زمانی عەرەبی , جێگای دەرچوون و سیفەتی پیتەکان ڕاوەستان و دەستپێکردن , زانستی ژماردنی ئایەتەکانی , شێوازی نوسینەوەی قورئان , باسەکانی ( أعوذ بالله من الشيطان الرجيم )باسەکانی وتنی ( الله أكبر ) .

423- **الوسطى :**بڕوان : توسط المد .

424- **الوقف :**ڕاوەستان .

- بڕین و ڕاگرتنی دەنگ لە سەر وشەیەك بۆ ساتێکی کەم کە هەناسەی تێدا بدرێت بە نیازی دەستپێکردنەوەی خوێندنی قورئان .

هەرکاتێکیش وشەی ( الوقف ) بەڕەهایی بێت ئەم واتایە دەگرێتەوە مەگەر کۆتێکی بۆ دیاری بکرێت واتایەکی تر بگرێتەوە , بە ( وقوف ) و ( أوقاف ) کۆدەکرێتەوە .

- لەلای زانا دێرینەکان دەربڕینی لێ دەکرێت لە ڕاوەستان ( إسكان ) جارجارەش مەبەستیان پێی بێ دەنگ بوونە واتە : السكت .

425- **وقف الابتلا ء:** بڕوانە : الوقف الاختباري .

426- **الوقف الاختباري:**ڕاوەستانی تاقیکردنەوە .

مەبەست لەو ڕاوەستانەیە کە خوێنەری قورئان داوا دەکرێت بە مەبەستی تاقیکردنەوەی , زۆرجاریش ئەوە بەکاردێت لە سەر ئەو ساتانەی بە شێوەیەکی جیا لە موسحەفدا نووسراوەتەوە , هەروەها لە ڕاوەستانی حەمزە و هیشام لە سەر پیتی هەمزەو , پێشی دەوترێت ( وقف الابتلا ء ) واتە : ڕاوەستانی تاقیکردنەوە .

427- **الوقف الاختیاری :**ڕاوەستانی هەڵبژاردن .

ئەو ڕاوەستانەیە کە خوێنەری قورئان مەبەستێتی تێدا ڕاوەستێت بەبێ دروست بوونی هیچ هۆکارێك , لەوانە : ڕاوەستانی تەواو و بەسبوون و جوان ( التام والکافی والحسن )

328- **الوقف الاضطراری:**ڕاوەستانی ناچاری .

بریتییە لەو ڕاوەستانەی کە بە هۆکاری تەنگەنەفەسی و هۆکاری لەو شێوەیە دروست دەبێت .

429- **وقف البیان:**ڕاوەستانی ڕوونکردنەوە .

- ڕاوەستانێکە بە مەبەستی ڕوونکردنەوەی واتایەك ئەنجام دەدرێت کە بە ڕاوەستان لە سەری نەبێت واتاکەی دەرناکەوێت و , بە ڕاوەستانی

جیاکردنەوە (وقف التمييز ) دەناسرێت , بۆ نموونە ڕاوەستان لەسەر (لتؤمنوا با لله ورسوله وتعزروه وتوقره)

وە دەست پێکردن بە : (وتسبحوه بكرة واصيلا ) الفتح / 9 چونکە ئاراستەکردنی (سبحان الله تەنها تايبەتە بۆ خوای گەورە بۆیە ئەگەر نەوەستێت و بەردەوام بێت گومانی بەشداربوونی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دروست دەکات , یان ڕاوەستانی لەو شێوە , بەڵام زۆربەی ئەو نموونانەی کە هێناویانەتەوە زمانی عەرەبی پشتگیری ناکات , هەر بۆیە زۆربەی زانایان لە نێو جۆرەکانی ڕاوەستاندا نەیان ژماردووە , لە نموونەی پێشوودا (وتسبحوه ) عەتف کراوەتە سەر واتای پێش خۆی و تەواو دەبێت , بۆیە لە ڕووی زمانەوانی واتایی و ڕەوانبێژیەوە بەردەوام بوون باشترە لە ڕاوەستان , چونکە ئەم ئایەتە بە ( اللف والنشر ) دادەنرێت وەکو لە زانستی (البديع) داهاتووە , لەم نموونە و هاوشێوەکانیشدا دەکرێت بخرێتە سەر جۆری ڕاوەستانی (الحسن) هەروەها نموونەیان بۆ هێناوەتەوە بە فەرموودەی خوای گەورە: ( وقال رجل مؤمن من ال فرعون يكتم ايمانة ) غافر / 28 کە ڕاوەستان لە سەر (مؤمن ) راوەستانی ڕوونکردنەوەیە , لە سەر ئەو واتایەی کە ئەو ئیماندارە لە خێزانی فیرعەون نەبووە بەڵام ئیمانەکەی لە ئەوان

دەشاردەوە , ئەمەش جێگای پرسیارە , بەهەرحاڵ دەکرێت پۆلێن بکرێت لە سەر جۆری ( الوقف الحسن ) .

430- **الوقف التام :**ڕاوەستانی تەواو .

- ئەو ڕاوەستانەیە کەوا هیچ پەیوەندییەکی بە پاش خۆیەوە نیە ,نە لە ڕووی وشەو نە لە ڕووی واتـا , بۆیە باشترە خوێنەر لە سەری ڕاوەستێت و لە پاش خۆیەوە دەست پێ بکات , زۆرتریش ئەم جۆرە ڕاوەستانە لە کۆتـای سورەتەکان و کۆتـای چیرۆکەکانی قورئـانی پیرۆزدا هەیە , پێشی دەوترێت : ( وقف التمام ) و ( الوقف المختار ) .
- لەلای زانا پێشینەکان واتـایەکی فراوانتر دەگەیەنێت و ڕاوەستانەکانی ( الجائز ) و ( الكافي ) و ( الحسن ) و ( الجائز ) دەگرێتەوە .

431- **وقف التذكر :**ڕاوەستانی بیرهاتنەوە .

واتە : خوێنەر ڕاوەستێت بە مەبەستی بەبیرهاتنەوەی ئەوەی دوای ڕاوەستانەکەی , بەبێ ئەوەی خوێندنەکەی ببڕێت , کەئەمەش لە جۆری ڕاوەستانی ناچارییە .

432- **وقف التعانق :**بڕوانە : المراقبە فی الوقف .

433- **الوقف التعريفی :**ڕاوەستانی پێناسەیی .

ئەم جۆرە ڕاوەستانە لە هەردوو جۆری ڕاوەستانی ناچاری و تاقیکردنەوە پێکدێت , بۆ نموونە بوەستێت بە مەبەستی فێرکردنی خوێنەرێك , یان ولآمدانەوەی کەسێك تاقیبکرێتەوە یان ئاگادارکردنەوەی کەسێك سەبارەت بە چۆنێتی ڕاوەستان .

434- **وقف التعسف :**بڕوانە : الوقف المتعسف .

435- **وقف التمام :**بڕوانە : الوقف التام .

436- **وقف التمييز :**بڕوانە : وقف البيان .

437- **الوقف الجائز :**بڕوانە : الوقف الكافي .

438- **وقف جبريل عليه السلام :**بڕوانە : وقف السنه .

439- **الوقف الحسن :**ڕاوەستانی جوان .

بریتییە لەو ڕاوەستانەی کە پەیوەندی بە دوای خۆیەوە هەیە لە ڕووی وشەو واتاوە , پێویستی بە دوای خۆی نیە , چونکە واتاکەی ڕوونە , بەلآم واتای پاش خۆی پێویستی پێیەتی بە هۆی ئەوەی وشەکانی درێژە پێدانی وشەکانی پێش خۆیەتی , بۆ نموونە ڕاوەستان لە سەر وشەی مەزنی ( الله ) لە سورەتی ( الفاتحه ) : ( الحمد لله رب العلمين ) كە جائیزە لە سەری ڕادەوەستێت , چونکە مەبەست ئاشکرایە تێدا , بەلآم

ناکرێت لە (رب العالمين ) دەست پێ بکرێت چونکە پەیوەندی بە پێش خۆیەوە هەیە , هەروەها هەموو ڕاوەستانێکی (حسن ) ڕاوەستانێکی جوان و بە سوودە بە مەرجێك لە دوای خۆیەوە دەست پێ نەکرێت بە هۆی پەیوەندی وشەیی واتایی لە نیوانیاندا , ئەم جۆرە پێشی دەوترێت : (الوقف المستحسن) . هەندێ لە زانایانیش وەکو بۆچوونێکی نابەناوبانگ  ئەم جۆرە ڕاوەستانە لە گەڵ ڕاوەستانی ( الكافي ) وەکو یەك دادەنێت , هەندێکیشان ڕاوەستانی ( الحسن ) پلەی بەرزترە بەلایانەوە لە ڕاوەستانی (الكافي) .

440 وقف السنة :ڕاوەستانی سوننەتی .

ڕاوەستان لە سەر کۆتایی ئایەتەکان وەکو شوێنکەوتن بۆ ڕێنمایەکانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سەبارەت بە ڕاوەستان لە سەر کۆتایی ئایەتەکان .

بەڵام سەبارەت بەوەی کە دەدرێتە پاڵی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کە بە ڕاوەستانی جبريل دەناسرێت , یان ڕاوەستانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئەوە بە هیچ زنجیرە سەنەدێکی متمانە پێکراو نەهاتووەو جێگیر نەبووە ,

441- الوقف الصالح :بڕوانە : الوقف الكافى .

442- الوقف القبيح :ڕاوەستانی ناشیرین .

ئەو ڕاوەستانەیە کە واتاکەی ڕوون نیە وەکو ڕاوەستان لە سەر ( الحمد ) لە سورەتی ( الفاتحه ) ئەم جۆرە ڕاوەستانە ش کاری پیٚ ناکریٚت مەگەر لە ڕووی ناچاری نەبیٚت وەکو کورت بوونی هەناسەو کۆکەو شتی لەو جۆرە , چونکە یان واتاکەی نوقسان دەبیٚت یان تیٚکدەچیٚت , نوقسانی واتا وەکو نموونەی پیٚشوو , یان گۆڕینی وەکو ڕاوەستان لە سەر فەرموودەی خوای گەورە : ( ان الله لايستحيى ) البقرة / 26 ئەم جۆرە ڕاوەستانە پیٚشی دەوتریٚت : ( الوقف الناقص ) و ( الوقف الممنوع )

443- الوقف الكافي :ڕاوەستانی بەسبوون .

واتە : پەیوەندی بە دوای خۆیەوە هەیە لە ڕووی واتاوە نەك وشەوە , لە هەموو وتەیەکی سەربەخۆی بیٚ پیٚویست بە بکەر وەکو ڕاوەستان لە سەر وشەی ( منا ) و ( العليم ) لە فەرموودەی خوای گەورە : ( ربنا تقبل منا انك انت السميع العليم ) هەروەها دەست پیٚکردنیش لە دوای ئەوە . ئەم جۆرە ڕاوەستانە پیٚشی دەوتریٚت : ( الوقف الصالح ) و ( المفهوم ) و ( الجائز )

هەندێ لە زانایانیش لە بۆچوونی نابەناوبانگدا جیاوازی ناكەن لە نیوان هەردوو ڕاوەستانی (الكامی ) و (الحسن ) , هەندێكیشیان پلەی ڕاوەستانی (الكافي ) بە كەمتر دەبینن لە پلەی (الحسن ) .

444- **الوقف الكامل :**ڕاوەستانی پێگەیو , تەواو .

بەرزترین پلەكانی تەواوە , وەكو ڕاوەستان لە سەر كۆتایی سورەتەكان .

445- **الوقف اللازم :**بڕوانە : الوقف الواجب .

446- **الوقف المتعسف :**ڕاوەستانی زۆرداری .

ئەو جۆرە ڕاوەستانە دەگرێتەوە كە هەندێ لە قورئا نخوێنان بە زۆر ئە نجامی دەدەن , یان هەندێ خاوەن ئارەزووبیدعەكان بە مەبەستێكی دیاریكراو ئە نجامی دەدەن , پێی دەوترێت (الوقف المتكلف ) زانایانی قیرائات ئەوپەڕی نارەزاییان نیشان داوە بەرانبەر ئەوجۆرە ڕاوەستانە , لەوانە ڕاوەستانی هەندێكیان لە سەر فەرموودەی خوای گەورە ( الاتشرك ) و دەست پێكردن لە دوای ئەوە بە ( باللة ان الشرك لظلم عظیم ) بە واتای سوێند خواردن .

447- **الوقف المتكلف :** بڕوانە : الوقف المتعسف0

448- **الوقف المجوز لضرورة:**ڕاوەستانی ڕێگە پێدراو لە بەر پێویستی ئەو ڕاوەستانەیە كە بە هۆی درێژی چیرۆك و برگەیە هەروەها

لە حاڵەتی کۆکردنەوەی قیرائات و مەبەستی فێرکردن و شتی لەو جۆرە , پەیوەستیش ناکرێت بە گەڕانەوە چونکە برگەی پاش خۆی واتاکەی روونە .

449- **الوقف المجوز لوجة:** ڕاوەستانی ڕێگە پێدراو لە بەر هەر هۆکارێك بریتیە لەو ڕاوەستانەی کە دوو واتا لە خۆی دەگرێت یان دوو ئیعراب هەڵدەگرێت , بە پێی یەکێکیان پێویستە بەردەوام بێت لە خوێندن و بە پێی ئەو واتاکەی تر پێویستە ڕاوەستێت .

450- **الوقف المختار:** بڕوانە : الوقف التام .

451- **وقف المراقبة:** بڕوانە : مراقبة الوقف .

452- **الوقف المستحسن:** بڕوانە : الوقف الحسن .

453- **الوقف المطلق:** ڕاوەستانی ڕەها .

لە لای ( السجاوندي ك د 560 ك ) بریتیە لەوەی کە جوانترە لە پاشیەوە دەست پێ بکرێت , لە گەڵ جۆرەکانی ڕاوەستانی ( التام ) و ( الکافي ) دەچنە ناویەکتریەوە .

454- - **الوقف المفهوم :** بڕوانە : الوقف الکافي.

455- **الوقف الممنوع :** بڕوانە : الوقف القبيح .

456- **الوقف الناقص :** بڕوانە : الوقف القبیح .

457- **وقف النبی صلی الله علیه وسلم:** بڕوانە : وقف السنه .

458- **الوقف الواجب:** ڕاوەستانی پێویست .

بە پێی ئەم زاراوەیە جەخت دەكرێتەوە لە سەر ئەم جۆرە ڕاوەستانە بۆ دەرخستنی واتای ویستراو , چونكە ئەگەر خوێنەر ڕانەوەستێت و بەردەوام بێت لە خوێندن گومانی واتایەكی تری نەویستراو دروست دەكات , دەربڕینیشی لێ دەكرێت بە ڕاوەستانی هۆگر ( الوقف اللازم ) بەو واتایەش نایەت كە لەلایەن شەرعناسانەوە بە شایستەی سزادادەنرێت , هیماكەشی لە زۆرینەی موسحەفە خۆرهەڵاتییەكان كە دەستاو دەستی پێدەكرێت بریتیە لە پیتی ( م ) واتە : ڕاوەستانی هۆگر .

459- **الوقف الانتظاری :** ڕاوەستانی چاوەڕوانی .

بریتییە لەوەی خوێنەر لە سەر ئەو وشانە ڕاوەستێت كە زیاتر لە خوێندنەوەیەكی تێدایە بە مەبەستی تەواوكردنی شێوازەكانی لە كاتی كۆكردنەوەی ڕیوایەتەكان .

460- **وقف جائز :** ڕاوەستانی ڕێپێدراو .

بریتیە لەو ڕاوەستانەی كە بە جوان و ڕێك و پێك دەژمێردرێت لە كاتی خوێندندا .

461- **وقفة خفيفة**:بڕوانه : السكت .

462- **وقفة يسيرة**: بڕوانه : السكت .

463- **الوقفية**: ڕاوەستان .

لەلای خۆرئاواییەکان بەو هونەرە دەوترێت کە تایبەتە بە ڕاوەستانەکانی قورئانی پیرۆز

464- **وقوف**: بڕوانه : الوقف .

465- **وقوف الهبطي** :ڕاوەستانی ( الهبطي )

ئەم جۆرە ڕاوەستانە دەدرێتە پاڵ زانای ڕۆژئاوایی ( محمد بن جمعة الهبطي ) , زۆربەی خەڵکی وڵاتانی ڕۆژئاوا کە بە قیرائەتی ( نافع ك د 169 ك ) قورئان دەخوێنین تاکو ئەم ڕۆژگارەی خۆمان پەیڕەوی دەکەن , ئەم جۆرە ڕاوەستانانە بنیات نراوە لە سەر بنەمای واتاو ئیعراب ئەگەر چی هەندێك ڕاوەستانی نامۆیشی لە خۆگرتووە , بەم دواییانەش لە کتێبەکەیدا بە ناونیشانی : ( تقييد وقف القران الكريم ) چاپ کرا , بۆیەش پێی وتراوە ( تقييد ) چونکە هەندێ لە قوتابییەکانی ئەوزانایە لە زاری مامۆستاکەیان نووسیویانە .

466- **الوقيفه** :بڕوانه : السكت .

# پیتی ( ی )

467- **اليا ء** : پیتی ( ی )

لەلای زانا دێرینەکان مەبەست پێی :

- لارکردنەوەی گەورە ( الاماله الكبرى ) یە .
- ئاسانکردن ( التسهيل ) لە نیوان هەمزەی جێبەجێکراو پیتی ( ی )

468- **ياءات الإضافة** : پیتەکانییائە زیادکراو .

مەبەست لەو پیتە یائانەیە کە ئاماژە بۆ قسەکەری تاك دەکات وەکو هەردوو پیتی یائی کۆتایی لە وشەی ( إني ) و ( ليحزنني ) لە فەرموودەی خوایگەورە:( إنى ليحزننى ) کە زانایان جیاوازییان لە نێواندایە سەبارەت بە خوێندنەوەیان بە فەتحەو بە سکون لە کاتیڕانەوەستاندا ، هەر بۆیە پێشی دەوترێت:( الياءات المتحركة ) واتە : یائە جوولاوەکان، هەروەها پێی دەوترێت: ( ياءات المتكلم ) واتە: پیتییائی قسەکەر چونکە ئاماژە بۆ تاکی قسەکەر دەکات، هەندێکیش بە ( الياءات المضافات ) ناوی دەبەنن.

469- **ياءات الزوائد** : پیتەکانی یائەزیادەکان.

مەبەست لەم زاراوەیە ئەو پیتانەی یائە لە کۆتای وشەوە دێن و لابراوە لە شێوازی نووسینی موسحەف و لە بنچینەشدا لە پەیکەری وشەکەدا بوونی هەیە , بۆ نموونە : وەکو ئەو دوو پیتی یائەی لە وشەکانی (الداعي) و (دعاني) لە فەرموودەی خوای گەورە : (الداع إذا دعان) البقرة / 186. جیاوازی قیرائاتیش لەو بارەوە بریتیە لەوەی لە نێوان لابردن و جێگیرکردنیدا دروست دەبێت لە کاتی ڕاوەستان و بەردەوام

470- الياءات المتحركة :بڕوانە : ياءات الاضافة .

471- ياءات المتكلم : بڕوانە : ياءات الاضافة .

472-الياءات المحذوفة : بڕوانە : ياءات الزوائد .

473- الياءات المضافات : بڕوانە ياءات الاضافة .

474- اليائي :وشەی یائي .

ئەمە زاراوەیەکە لە زانستی قیرائات ئەو وشانە دەگرێتەوە کە بە پیتی (ي) نووسراون وەکو : ( ضحاها ) الشمس / 3.

**سوپاس بۆ خوای گەورە ئێوارەی ڕۆژی ( 28- ربيع الثاني 1435 ك ) ڕێکەوتی ( 28- 2- 2014ز ) وەرگێڕانی کتێبی ( معجم مصطلحات القراءات ) م تەواو کرد والحمد لله الذي بنعمته تتم الصالحات .**

**احسان برهان الدين  کەلار**

# پێڕست

## گرنگترین سەرچاوەکان

1- الإبانة عن معاني القراءات،مكي بن أبي طالب القيسي، تحقيق محي الدين رمضان ،دمشق،دار المأمون للتراث،1399هـ

2- إبراز المعاني من حرالأماني،عبد الرحمن بن إسماعيل أبوشامة المقدسي، تحقيق إبراهيم عطوة عوض،القاهرة،مصطفى البابي الحلبي1402هـ

3- إتحاف فضلاء البشر بالقراءات الأربعة عشر،أحمد بن محمد البنا الدمياطي، تحقيق د.شعبان محمد إسماعيل،بيروت (دار عالم الكتب)،القاهرة ،(الكليات الازهرية)،1407هـ

4- إرشاد المريد الى مقصود القصيد،علي بنمحمد الضباع،القاهرة،مكتبة و مطبعة محمدعلي صبيح

5- الإضاءة في بيان اصول القراءت،علي بن محمد الضباع،القاهرة،مكتبة عبدالحميد احمد حنفي

6- إعراب القراءات السبع و عللها،الحسين بن احمد خلويه، تحقيق د.عبدالرحمن سليمان العثيمين،القاهرة،مكتية الخانجي،1413هـ

7- الاقناع في القراءات السبع،احمد بن علي بن الباذش، تحقيق

د.عبدالمجيد بن قطامش، مكةالمكرمة، مركزالبحث العلمي، 1403هـ

8- الاكتفاء في القراءات السبع المشهورة، إسماعيل بن خلف، تحقيق د.حاتم الضامن، بغداد، 1426هـ

9- الإمام المتولي و جهوده في القراءات، ابراهيم بن سعيد الدوسري، الرياض، مكتبة الرشد، 1420هـ

10- الإنفرادات عند علماء القراءات، امين محمد الشنقيطي، المدينة المنورة، الجامعة السلامية، رسالة الدكتوراه، 1420هـ

11- ألإيضاح في القراءات أحمد بن أبي عمرألأندرابي، خطوط مصور في جامعة الإمام في الرياض، رقم876/ف

12- البدورالزاهرة في القراءات العشر المتواترة من طريقي الشاطبية و الدرة، عبدالفتاح بن عبدالغني القاضي بيروت, دار الكتب العربي ,1401هـ

13- البدور الزاهرة في القراءات العشرة المتواترة، عمر بن زين الدين قاسم النشار ، تحقيق علي محمد معوض وزملائه ، بيروت، عالم الكتب 1421هـ

14- البرهان في علوم القران ، محمد بن عبدالله الزركشي ، تحقيق محمد ابو فضل إبراهيم .

15- بستان الهداة ،في إختلاف الأئمة و الرواة ،ابو بكر بن الجندي بن

ايدغدى ، تحقيق حسين العواجي ،المدينة المنورة ،رسالة ماجستير في الجامعة الاسلامية ،1416هـ

16- تأملات حول تحريرات العلماء للقراءات المتواترة،عبدالرزاق بن علي بن إبراهيم موسى،المدينةالمنورة،مطابع الرشيد،1413هـ

17- تأويل مشكل القرآن،عبدالله بن مسلم بن قتيبة،المدينة المنورة،المكتبة العلمية، تحقيق السيد أحمد صقر،الطبعة الثالثة،1401هـ

18- التجريد لبغية المريد في القراءات السبع،عبدالرحمن بن عتيق المعروف بإبن الفحام، تحقيق د.ضاريبن إبراهيم الدوري،عمان،دار العمار،1422هـ

19- التحرير والتنوير، محمد طاهر بن عاشور،1984م،تونس،دار التونسية

20- التذكرة في القراءات الثمان طاهر بن عبدالمنعم إبن غليون، تحقيق ايمن رشدي سويد،جدة،الجمعية الخيرية لتحفيظ القرآن الكريم،1412هـ

21- ترتيب العلوم، محمد بن ابي بكر المرعشي الشهير بساجقلي زاده،، تحقيق محمد بن إسماعيل السيد،بيروت،دار البشائر الإسلامية،1408هـ

22- تقييد وقف القرآن الكريم ، محمد بن ابي جمعة الهبطي، تحقيق

د.الحسن بن أحمد وكاك، 1411هـ

23- التخليص في القراءات الثمان،ابو معشر بن عبدالكريم بن عبدالصمدالطبري، تحقيق محمد حسن عقيل، جدة،الجمعية الخيرية لتحفيظ القرآن الكريم، 1412هـ

24- الجعبري و منهجه في كنز المعاني شرح حرز الأماني ووجة التهائي مع تحقيق نموذج من لكنز،دراسة و تحقيق أحمد اليزيدي،المغرب،وزارة الأوقاف و الشؤون الإسلامية، 1419هـ

25- جمال القراء و كمال الإقراء،علي بن محمد السخاوي، تحقيق د.علي البواب،مكةمكرمة،مكتبة التراث، 1408هـ

26- الحجة للقراء السبعة،ابو علي الحسن بن عبدالغفار الفارسي، تحقيق بدر الدين قهوجي و بشير جويجاتيدمشق دار المأمون

27- حرز الأماني و وجه التهائي( الشاطبية )،ابو قاسم بن فيرة الشاطبي،تصحيح علي بن محمد الضباع،القاهرةمصطفى البابي الحلبي، 355هـ

28- الرعاية لتجويد القراءة و تحقيق لفظ التلاوة،مكي بن أبي طالب القيسي، تحقيق د.أحمد حسن فرحات،عمان،دار العمار،الطبعة الثانية، 1404هـ

29- اليبعة في القراءات،أحمد بن موسى بن مجاهد، تحقيق د.شوقي ضيف،الطبعة الثاني ،القاهرة ،دار المعارف

30- سورتا الفاتحة و البقرة من المصباح الزاهر، تحقيق إبراهيم بن سعيد الدوسري، مجلة جامعة الإمام محمد بن سعود الإسلامية،العدد32،1412هـ

31- شرح اصول الشاطبية،صدقة بن سلام المسحراتي، مخطوط،نسخة فريدة في المكتبة الازهرية،رقم( 1401 )، مجاميع( 32864 ).

32- شرح الدرر اللوامع في اصل مقرأ الإمام نافع محمد بن عبدالملك المنتوري، تحقيق الصديقي سيدس فوزي،الدار البيضاء، 1421هـ

33- شرح قصيدة أبي مزاحم الخاقاني التي قالها في حسن الأداء ( شرح القصيدة الخاقانية )عثمان بن سعيد الداني، تحقيق غازي بن بنيدر الحربي ،رسالة ماجستير في جامعة أم قرى ،1418هـ

34- شواذ القراءات، محمد بن أبي نصر الكرماني ، تحقيق د.شمران العجلي، بيروت، مؤسسة البلاغ 1422هـ

35- الطراز المتضمن لأسرار البلاغة و علوم حقائق الإعجاز

36- طيبة النشر في القراءات العشر ، محمدبن محمد الجزري،عناية علي بن محمد الضباع،القاهرة ،مصطفى البابي الحلبي،1369هـ

37- علل الوقوف، محمد بن طيفو السجاوندي ، تحقيق د. محمد بن عبدالله العيدي، الرياض، دار الرشد، 1415هـ

38- العين، الخليل بن أحمد الفراهيديتحقيق د.مهدي المخزومي و د.إبراهيم السامراني، بيروت، مؤسسة العلمي للمطبوعات، 1408هـ

39- غاية الإختصار أبو العلاء الحسن بن أحمد الهمذاني ، تحقيق أشرف طلعت، جدة، الجمعية الخيرية لتحفيظ القرآن الكريم، 1414هـ

40- غاية النهاية في طبعات القراء، محمد بن محمد بن الجزري، بيروت، دار الكتب، الطبعة الثالثة ، 1402هـ

41- الغاية في القراءات العشر، أحمد بن الحسين بن مهران الأصبهاني، تحقيق، محمد غياث الجنباز، الرياض، دار الشواف، الطبعة الثاني ، 1411هـ

42- غنية الطالبين و منية الراغبين( المعروفة بالمقدمة البقرية في علم التجويد )، محمد بن قاسم البقري، تحقيق محمدمعاذ مصطفى الخن، بيروت، دار الإعلام، 1423هـ

43- غيث النفع في القراءات السبع، علي النوري الصفاقسي، القاهرة، مصطفى البابي الحلبي ، الطبعة الثالثة، 1373هـ

44- فتح الوصيد في شرح القصيد، علي بن محمد السخاوي، تحقيق أحمد عدنان الزعبي، الكويت، دار البيان، 1423هـ

45- فضائل القرآن، اسماعيل بن كثير الدمشقي، بيروت، دار المعرفة، 1406هـ

46- فضائل القرآن و معالمه و آدابه، القاسم بن سلام أبو عبيد البغدادي، تحقيق أحمد الخياطي، المغرب، مطبعة الفضالة، 1415هـ

47- الفوائد الجميلة على الآيات الجليلة، الحسين بن علي الرجراجي، تحقيق إدريس عزوزي، المغرب وزارة الأوقاف و الشؤون الإسلامية، 1409هـ

48- القاموس المحيط، محمد بن يعقوب الفيروز آبادي، بيروت، مؤسسة الرسالة، الطبعة الثانية، 1407هـ

49- القراء و القراءات بالمغرب، سعيد إعراب، بيروت، دارالمغرب الإسلامي، 1401هـ

50- القراءات الثماني للقرآن الكريم، الحسن بن علي العُماني، تحقيق إبراهيم عطوة عوض وأحمد حسين صقر، سلطنةعمان، دار اخبار اليوم، 1415هـ

51- القراءات القرآنية تاريخها، ثبوتها، حجيتها، وأحكامها، عبدالحليم بن

محمد الهادي القابة، بيروت، دار المغرب الإسلامي، 1419هـ

52- قراءات النبي ( صل الله عليه و سلم )، حفص بن عمر الدُّوري، تحقيق د. حكمت بشير ياسين، المدينة المنورة ،مكتبة الدار ،1408هـ

53- القراءات في نظر المستشرقين و الملحدين، عبد الفتاح بن عبد الغني القاضي، المدينة المنورة، مكتبة الدار

54- القواعد و الإشارات في اصول القراءات، احمد بن عمر الحموي، تحقيق د.عبد الكريم بن محمد الحسن بكار، دمشق، دار القلم، 1406هـ

55- الكامل في القراءات الخمسين، أبو قاسم يوسف بن جبارة الهذلي، مخطوط، نسخة رواق المغاربة في الازهر، رقم 369

56- الكشف عن وجوه القراءات السبع و عللها و حججها، مكي بن أبي طالب القيسي، تحقيق د. محي الدين رمضان، مؤسسة الرسالة ،طبعة الثانية ،1401هـ

57- كنز المعاني شرح حرز الأماني( شرح شعلة على الشاطبية )، محمد بن أحمد الحسين الموصلي، عناية علي بن محمد الضباع وآخرون، القاهرة ،الإتحاد العام لجماعة القراء، 1374هـ

58- الكنز في القراءات العشر ،عبدللهبن عبد المؤمن الواسطي، تحقيق هناء

الحمصي ،بيروت، دار الكتب العلمية

59- لسان العرب محمد بن مكرم بن منظور ،بيروت،دار صادر

60- لطائف الإشارات لفنون القراءات،أحمد بن محمد القسطلاني، تحقيق عامر السيد عثمان،د.عبد الصبور شاهين،القاهرة ،المجلس الاعلى للشؤون الإسلامية،1392هـ

61- مبرز المعاني شرح حرز الاماني ، محمد بن عمر العمادي ،مكة المكرمة،نسخة ميكروفيليمية في مكتبة الحرم المكي،رقم الفلم( 4843 )،رقم المخطوط( 42 )

62- المبسوط في القراءات العشر،أحمد بن الحسين بنمهران الاصبهاني، تحقيق سبيع حمزة،دمشق، مجمع اللغة العربية

63- مرشد القارئ الى تحقيق المقارئ،عبدالعزيز بن علي ( إبن الطحّان )، تحقيق د.حاتم صالح ضامن،عمان، مجلة مجمع اللغة العربية الاردني،العدد( 48 )1415هـ

64-المرشد الوجيز الى علوم تتعلق بالكتاب العزيز،أبو شامة عبدالرحمن بن إسماعيل المقدسي، تحقيق د.طيار آلتي قولاج،بيروت ،دار صادر،13995هـ

65- المصاحف،إبن ابي داود السجستاني، تحقيق د. محب الدين عبدالسبحان

واعظ، بيروت،دار البشائر الإسلامية،الطبعة الثانية ،1423هـ

66- المصباح الزاهر في القراءات العشر البواهر،المبارك بن الحسن الشهرزري، تحقيق إبراهيم بن سعيد الدوسري،الرياض، جامعة الإمام بن سعود الإسلامية،رسالة دكتوراة، 1414هـ

67- المكتفي في الوقف و الإبتداء في كتاب لله عز وجل، عثمان بن سعيد الداني، تحقيق د.يوسف المرعشلي 1404هـ بيروت، مؤسسة الرسالة

68- منار الهدى في الوقف و الإبتدا ،أحمد بن محمد الأشموني،القاهرة،مصطفى البابي الحلبي،الطبعة الثالثة،1393هـ

69- منجد المقرئين و مرشد الطالبين ، محمد بن محمد الجزري، تحقيق علي العمران،مكة المكرمة،دار عالم الفوائد،1419هـ

70- المنهاج في الحكم علي القراءات ،إبراهيم بن سعيد الدوسري،مكة المكرمة، مجلة جامعة أم القرى لعلوم الشريعة و اللغة العربية و آدابها،العدد( 24 )،1423هـ

71- الموضح في التجويد،عبدالوهاب القرطي، تحقيق د.غانم قدوري الحمد،عمان دار العمار، 1421هـ

72- الموضح في وجوه القراءات و عللها،نصر بن علي الشيرازي المشهور بإبن أبي مريم، تحقيق د.عمر حمدان الكبيسي،مكة المكرمة،الجماعة الخيرية

لتحفيظ القرآن الكريم بجدة،1414هـ

73- النشر في القراءات العشر، محمد بن محمد الجزري،إشراف علي الضباع،بيروت، دار الكتب العلمية

74- نهاية القول المفيد في علم التجويد، محمد مكي نصر، لاهور،المكتبة العلمية ،1391هـ

75- النهاية في غريب الحديث،المبارك بن محمد إبن الأثير، تحقيق طاهر الزاوي و محمود الطناحي،بيروت

76- الهادي في معرفة المقاطع و المبادي،الحسن بن أحمد العطار الهمذاني، تحقيق سلمان بن حمد الصقري الرياض،جامعة الإمام محمد بن سعود الإسلامية،رسالة دكتوراة ،1411هـ

77- الهادي في معرفة المقاطع و المبادي،الحسن بن أحمد العطار الهمذاني، مخطوط،دار الكتب رقم( 585 ).

تم بحمدالله

وە

**<u>وەرگێڕ لە چەند دێڕێکدا :</u>**

- **إحسان برهان الدين, لە دایکبووی ساڵی** 1974.
- **ماستەر لە زمانی عەرەبی و کاندیدی دکتۆرایە لە بواری ( الادب العربی ) لە زانکۆی سلێمانی.**
- **مامۆستایە لە بەشی زمانی عەرەبی لە زانکۆی هەڵە بجە.**
- **بەڕێوەبەری ناوەندی ( ابن الجزری ) یە بۆ قیراوات و لەبەر کردنی قورئانی پیرۆز.**
- **ژمارەیەك کتێبی بە چاپ گەیشتوون, لەوانە :**
  - ❖ **ژیاننامەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم/** 2 **بەرگ/ وەرگێڕان.**
  - ❖ **شەرحی هۆنراوەی جەزەرییە بە کوردی.**
  - ❖ **کۆتایی جیهان ی محمد العریفی /وەرگێڕان.**
  - ❖ **السراج المنير في ترتيب أحاديث الجامع الصغير/**4 **بەرگ/وەرگێڕان/هاوبەش.**
  - ❖ **نزار قباني ولوثة الفكر الحداثي في شعره.**
  - ❖ **الا تجاه الاسلامي في شعر وليدالاعظمي/ رسالة**

**ماجستير/ غير مطبوعة.**

- **التناص في شعر عمر بهاء الأميري, ديوان مع الله أنموذجاً.**
- **سەردەمی خیلافەتی ڕاشیدە/ وەرگێڕان.**